# سەلماندنێك

## لەسەر كافربونی یاسادانەر بەبێ مەرجی جەحد و ئینكار

نوسینی

عبدالله بتوێنی

# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

أما بعد....

بە ئیزنی الله لەم كتێبەدا بە چەند دەلیل و بەڵگەیەك كە تا ئێستا باسمان نەكردوون بەم جۆرەی ئێستاكە دەیسەلمێنین كە یاسادانان و تەشریع كوفری أكبری دەركەر لە ئیسلامە بەبێ هیچ مەرجێكی جەحد و ئینكاری كردنێك.

دەیسەلمێنین كە ئیمان بریتیە لە إعتقاد و قەول و عەمەل كە وجودی هەرسێكیان مەرجن بۆ هێنانی ئیمان كە لە نەقس و نەبوونی یەكێكیان ئیمان نامێنێت و مرۆڤ كافر دەبێتەوە، هیچ كامیان بێ هیچ كامیان نایكرێت.

وە باسی جۆرەكانی عەمەل دەكەین و باسی پەیوەندیەكانی هەردوو جۆرە عەمەلەكە دەكەین لەگەڵ ئیماندا و باسی ئەوەش دەكەین كە لە چ كاتێكدا ئەو دوو جۆرە عەمەلە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمان.

وە دەیسەلمێنین كاتێك حاكم یاسا دادەنێت پێچەوانەی شەرعی الله یاساكانی الله پەك دەخات و تەركی پابەند بوون بە الله ـوە دەكات كە ئەگەر معرفەی قەلبی و إقراری قەولیشی هەبوو و جەحد و ئینكاریشی نەكرد مادەم عەمەلی نەبوو بە حوكم و ئەمری الله ـوە بەوەی كە یاساكەی خۆی دەخاتە جێگای یاساكەی الله ـوە و پابەند نابێت بە عەمەل

كردن بە یاسای الله ـوە بەمە تەركی جنسی عەمەل دەكات و بەمە كافر دەبێتەوە.

## یاسادانان(تشریع) چییە؟

یاسادانان بریتیە لە دانانی كۆمەڵە یاسایەكی دانراوی پابەندكراوی دەركراو لەلایەن لیژنەیەكی تایبەتكراو بەو كارەوە كە لەلایەن دەوڵەتێكەوە دیاریكراوون و تایبەتكراون بەو كارە كە پێیان دەگوترێت دەسەڵاتی یاسادانەر**(سلطة التشریع)**، كە ڕێگەدەدات و ڕێگری دەكات و ڕێكخستن دەكات بۆ دیاریكردنی بەرنامەی كاری ڕۆژانەی وڵاتەكەیان و خەڵكی ژێردەستیان، ئەمەش بە فرمان دان بە دەسەڵاتی جێبەجێكردن**(سلطة التنفیذ)** بەوەی كە هەموو لایەنێك كە ئەو یاسایە دەیگرێتەوە پابەند بكات بەو یاسایەوە.

بە مانایەكی دیكە یاسادانان بریتیە لە دانانی چەند بنچینە یاسایەك كە دەردەچێت لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانەرەوە كە لە دۆكیومێنێتكی نوسراودا دەپارێزرێت كە پێی دەگوترێت **دەستوور.**

لەم دەستوورەشدا كۆمەڵە یاسایەك هەن كە بەڕێوەبردنی وڵاتی لەسەر بنیاد نراوە، كە ڕێكخستنی ژیانی خەڵكی تێدایە، لە بواری تاكی لە بواری خێزانی لە بواری كۆمەڵایەتی و لە بواری سیاسی و لە بواری ئابوری.

بۆ نمونە: لە دەستووری وڵاتدا هاتووە كە هەموو ئەو كۆمپانیایانەی لەو وڵاتەدا بازرگانی و وەبەرهێنان دەكەن پێویستە ساڵانە بڕێكی دیاریكراو لە بەخشش دیارییەكەن كە بدرێت بە حكومەت لە بەرامبەر ڕێگەدان و ڕەخساندنی بار و سروشتێكی گونجاو بۆ قازانجكردنی ئەو كۆمپانیایە كە لە ژێر هەلومەرجی سەلامەتی ئەو حكومەتەدا ئەو كۆمپانیایە ئیشەكانی

بەڕێوەدەبات و قازانجی خۆی دەكات، كە پێویستە ساڵانە بڕە پارەیەكی دیاریكراو بدات بەو دەسەڵاتە كە پێی دەگوترێت **باج**.

وە دەستوور فرمان دەدات بە دەسەڵاتی جێبەجێكردن(سلطة التنفیذ) بە جێبەجێكردنی ئەو هەنگاوانەی كە دەستوور داوای لێكردوون بۆ وەرگرتنی باج، یاسای باج كە دانراوە پێویستە هەموو ئەو لایەنانەی كە یاساكە دەیگرێتەوە لە كۆمپانیا و دەزگاكانی وەبەرهێنان كە **پابەندی بن و بە هیچ شێوەیەك لێی لانەدەن**، كە ئەگەر هاتوو ڕۆژێك لە ڕۆژان كۆمپانیایەك پابەندی ئەم یاسایە نەبوو ئەوە ڕوبەڕووی سزای یاسایی دەبێتەوە كە دەستوور بۆی دیاریكردووە.

كەواتە لەم نمونەیەوە بۆمان ڕوون دەبتەوە كە هەر شتێك دەستووری وڵات ئەمری پێكرد ئەوە پێویستە هەموو ئەو لایەنانەی كە یاساكە دەیگرێتەوە چ لە دەسەڵاتی جێبەجێكار چ لە لایەنی بەسەرداسەپێنراو بێ جیاوازی مولزەم و پابەند بن بەو یاسایەوە و لێی لانەدەن، كە ئەگەر لێیان لادا ڕوبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە كە دەستوور بۆی دیاریكردوون.

كەواتە ئەگەر سوڵتەی تشریعی جۆرە یاسایەكی بە قانوون چەسپاند، ئەوە واتای ئەوەیە كە خاڵ و بەندەكانی ناو ئەو یاسا چەسپێنراوە دەبێ جێبەجێ بكرێن، لەو كاتەوەی كە سوڵتەی تشریعی فەرمان بە سوڵتەی تنفیذی دەكات بە تطبیق كردنی ئەو یاسایە، وە ئەمەش تا ئەوكاتە جێبەجێ دەكرێت كە سوڵتەی تشریعی گۆڕانكاری تێدا دەكات یان پێداچونەوە بۆ یاساكە دەكات.

ئیتر ئەم یاسا چەسپێنراوە لەو كاتەوەی دەردەچێت نیەتی لێ دەهێنرێت كە جێبەجێ بكرێت ئیتر دیار نیە كەی و چ كاتێك گۆڕانكاری بەسەردا دێت، و یاسای غەیری ئەوەش یان پێچەوانەی ئەو یاسا چەسپێنراوە هیچ بەهایەكی

نیە لەلای سوڵتەی تشریعی و هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت و ئەسڵەن جێبەجێ ناکرێت.

جا بەم یاسا و فەرمانانە ڕێچکە و ڕێباز و بەرنامەی ڕۆژانە بۆ خەڵکی ئەو وڵاتە دیاری دەکات و لەژێر چەتری فەرمانڕەوایی خۆیدا کۆیان دەکاتەوە کە غەیری یاساکانی ناو ئەم بەرنامەیە هیچ جۆرە یاسایەکی دیکە جێبەجێناکرێت و پشتگوێ دەخرێت، واتە ئەوەی کە دەستوور دیاری کردووە تەنها ئەو بەکارە لە وڵات و غەیری ئەوە معطلە و ئیشی پێ ناکرێت و غەیری ئەو یاسایە هیچ نرخێکی نیە لەو وڵاتە، کە ئەم یاسایانەش و ئەو شتانەشی ئێمە باسی دەکەین بە نوسراو دەنوسرێنەوە و هەر بە نوسراویش فەرمان بە جێبەجێکردنیان دەکرێت.

# ئیمان چیە، وە پەیوەندی یاسادانان چیە بە ئیمانەوە؟

ئیمان بریتیە لە بەڕاستدانانی هەموو ئەوەی کە رسول الله صلی الله علیه وسلم پێیەوە هاتووە لە ناخدا وە بریتیە لە پابەند بەوەی کە الله ئەمری پێکردووە بە گوێڕایەڵی کردنی لە ڕوکەشدا، وە هەموو زانایانی ئەهلی سونە چ لە سەلەف چ لە خەلەف کۆدەنگن لەوەی کە ئیمان بریتیە لە (إعتقاد و قەول و عەمەل) کە بەبێ یەکێك لەوانە ئیمان وجودی نامێنێت و بە نەبوونی یەکێك لەوانە مرۆڤ ئیسلامی نابێت و کافرە، بۆ نمونە ئەگەر یەکێك بە إعتقادی قەلبی و بە قەول إقرار بکات بە واجببونی ڕۆژو بەڵام ئامادە نەبێت بە هیچ جۆرێك بە عەمەل ڕۆژو بگرێت ئەوە کافرە و ئیمانەکەی باطڵە و إعتقادە قلبیەکەی و إقرارە زمانیەکەی هیچ سوودی پێ ناگەیێنێت، یان بۆ نمونە ئەگەر یەکێك بە عەمەل ڕۆژو بگرێت بەڵام بە إعتقاد باوەڕی بە ڕۆژو نەبێت ئەمیش بە هەمان شێوە کافرە و ئیمانەکەی باطڵە و وەکو مونافیقەکان وایە، کەواتە ئیمان بریتیە لە إعتقادی قەلبی إقراری قەولی و عەمەلی جەوارح.

زیاتر باسەکەی ئێمە لێرەدا لەسەر عەمەلە کە بە کۆدەنگی هەموو زانایان عەمەل بەشێکە لە ئیمان، وە عەمەل **شرطی صحەی** ئیمانە نەوەك **شرط کمالی** ئیمان.

(شرطی صحەی ئیمان بریتیە لە مەرجی هێنانی ئیمان، بەو مانایەی شتێك شرطی صحەی ئیمان بوو ئەمە واتای ئەوەیە کە بەبێ ئەو شتە ئیمان وجودی نیە و کافریت وەکو کوفر بە طاغوت، واتە کوفر بە طاغوت نەکەیت ئیمانت نەهێناوە و تۆ کافریت)

(بەلام شرطی کمالی ئیمان بریتیە لە مەرجی تەواوکەری ئیمان، واتە شتێك شرطی کمالی ئیمان بوو واتای ئەوەیە پێچەوانەی ئەمری الله لەمەدا لە ئیمانەکەت کەم دەکات بەڵام کافرت ناکات، وەکو ئەنجامدانی تاوانەکان)

 پرسیار

باشە کە دەڵێین عەمەل مەرجی هێنانی ئیمانە مەبەستمان لە چیە؟

لە وەڵامدا: مەبەستمان لەوویە کە ئیمان بەبێ عەمەل وجودی نابێت بە هیچ جۆرێك، واتە مرۆڤێك کە بە إعتقادی قەلبی و بە قەول إقرار بە هەموو ئەمرەکانی الله بکات، بەڵام ئامادە نەبێت عەمەل بەو ئەمرانە یان یەکێك لەو ئەمرانە بکات، ئەوە کافرە و ئیمانەکەی بەجێنەهێناوە و دانپێدانانی دڵ و زاری هیچ سودێکی پێ ناگەیێنن.

پرسیار

چەند جۆر عەمەلمان هەیە ؟

لە وەڵامدا: دوو جۆر عەمەلمان هەیە

1 - عەمەلێکمان هەیە کە **مەرجی هێنانی** ئیمانە، واتە گوێڕایەڵی کردنی الله لەم عمەلەدا مەرجە بۆ هێنانی ئیمان وتەنها یەکجار ئەنجامدانی سەرپێچی لەم جۆرەی عەمەلدا ئیمانەکەت هەڵدەوەشێتەوە و کافر دەبیتەوە بەبێ هیچ مەرجێکی إعتقاد، بۆ نمونە:

- ئەمرمان پێ دەکات کە چەکداری بۆ طاغوت نەکەین:

کوفرکردن بە طاغوت مەرجی هێنانی ئیمانە، واتە ئەگەر کەسێك ببێتە چەکداری طاغوت ئەوە کوفر بە طاغوتی ئەنجام نەداوە و تەنها بەم کارەی ئیمانەکەی نامێنێت و کافر دەبێت، سەرەڕای ئەوەی طاغووتەکە لە دڵەوە بە کافر بزانێت.

- ئەمرمان پێدەکات کە تەنها سوجدە بۆ ئەو بەرین:

الله تعالی بە تاکڕاگرتنی زاتی پیرۆزی خۆی کردووە بە مەرجی هێنانی ئیمان، واتە ئەگەر کەسێك الله بەتاك ڕانەگرێت لە پەرستنیدا و بە عەمەل سوجدە بۆ صنمێك ببات ئەوە شەریکی بۆ بریار داوە

هەرچەندە بە إعتقاد و قەولیش خۆی بە تاوانبار بزانێت چونكە مەرجێكی هێنانی ئیمانی بەجێنەگەیاندوە و ئیمانەكەی هەڵدەوەشێتەوە.

- ئەمرمان پێدەكات كافران سەرنەخەین بەسەر موسوڵمانانەدا:

سەرخستنی كافران بەسەر موسوڵمانانەدا كە بە عەمەل ئەنجامدەدرێت، هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانە و تەنها بە ئەنجامدانی ئەم عەمەلە مرۆڤ كافر دەبێتەوە سەرەڕای ئەوەی خۆشی بە تاوانبار زانی.

2 - عەمەلێكی دیكەمان هەیە كە **تەواوكەری** ئیمانە، واتە بە گوێڕیەڵی كردنی الله لەم عەمەلەدا لە ئیمانمان زیاد دەكات و ئەنجامدانی سەرپێچی لەم عەمەلەدا ئینسانی پێ كافر نابێتەوە، تەنها لە ئیمانەكەی كەم دەكات، نمونە بۆ ئەو عەمەلانەی كە لە ئیمانت كەمدەكەنەوە:

- قەتل
- زیناكردن
- دزی كردن
- ئارەق خواردنەوە

كە ئەنجامدانی هیچ كام لەو تاوانانەی سەرەوە ئینسانی پێ لە دین ناباتە دەرەوە بەڵام لە ئیمانەكەی كەم دەكاتەوە.

لەسەر جۆری یەكەمی عەمەل كە مەرجی هێنانی ئیمانە، هەر كاتێك تەنانەت یەكجاریش بێ ئەمری الله بكەیت و پێچەوانەی ئەمری اللەی تێدا بكەیت ئەوە تەنها بەو جارە كافر دەبیتەوە بەبێ هیچ مەرجێكی إعتقاد و قەول، بۆ نمونە یەك جار خاچپەرستانت سەرخست بەسەر موسوڵمانانەدا

لە ساحەی جیهاد ئەوە تۆ بەم كارەت كافر دەبیتەوە، چونكە بە دەقی ئایەت بۆمان ڕون بوەتەوە كە ئەو عەمەلە كوفرە، یان یەكجار جنێوێك بدرێتە الله كە تەنها خودی ئەم عەمەلە كافر بوونە بەبێ هیچ مەرجێكی إعتقاد.

لەسەر جۆری دووەمی عەمەل (كە تەواوكەری ئیمان بوو نەوەك مەرجی هێنانی ئیمان)، كە گوتمان ئەم جۆرەی عەمەل مەرجی هێنانی ئیمان نییە و تەواوكەری ئیمانە واتە یەكێك سەرپێچی لەم عەمەلەدا بكات، لە ئیمانەكەی كەم دەكات و پێی كافر نابێتەوە، بەڵام ئەم جۆری دووەمەش لە بنەڕەتدا هەر دەچێتەوە سەر مەرجی هێنانی ئیمان! چۆن؟

حەز دەكەم بە تصویر كردنێك و هێنانەوەی نمونەیەكی خەیاڵی ئەم جۆری دووەمەتان تێبگەیێنم كە ئایا زانایان گوتویانە ئیمان بەجێ نایەت ئیلا دەبێت عەمەلیشی لەگەڵ بێت، وە عەمەلیش تەنها جۆری یەكەم نیە و ئەم جۆری دووەمەش دەگرێتەوە (كە تەواوكەری ئیمان بوو نەوەك مەرجی هێنانی ئیمان)، ئایا چۆن و لە چ كاتێكدا ئەمیش دەبێتە مەرجی هێنانی ئیمان؟

بیهێننە پێش چاوتان كە لە هۆڵێكی زۆر گەورەی داخراودان كە ١٠٠٠ دانە گڵۆپی تێدا ئیش دەكات كە هۆڵەكە ڕووناك دەكەنەوە، كە هەر گڵۆپێك پلاكێكی تایبەت بە خۆی هەیە، واتە ١٠٠٠ گڵۆپمان هەبوو لەگەڵ ١٠٠٠ پلاك كە بە كوژاندنەوەی هەر پلاكێك یەكێك لە گڵۆپەكان دەكوژێتەوە!

دەتوانین بڵێین هۆڵەكە ئیمانی ئێمەیە و گڵۆپە ڕوناكەكانیش گوێڕایەڵی ئەمرەكانی اللەن بە عەمەل، كە هۆڵەكەمان بۆ ڕوناك دەكاتەوە واتە ئیمانمان بە بەهێزی بۆ دەهێڵێتەوە، كە كوژاندنەوەی دانە بە دانەی پلاكەكان دەبووە هۆی كوژاندنەوەی دانە بە دانەی گڵۆپەكان كە تا گڵۆپی زیاتر بكوژێنینەوە هۆڵەكە تاریكتر دەبێت، كە ئەم كوژاندنەوەیەش مانای

سەرپێچی کردنی ئەمرەکانی اللەیە، کە تا زیاتر سەرپێچی ئەمرەکانی اللە بکەین(بە کوژاندنەوەی گڵۆپەکان) زیاتر و زیاتر هۆڵەکەمان تاریك دەبێت کە ئەمەش مانای دابەزینی ئاستی ئیمانە، یان تا زیاتر و زیاتر گوێڕایەڵی ئەمرەکانی اللە بکەین(بە کردنەوەی پلاکی گڵۆپە کوژێنراوەکان) زیاتر و زیاتر هۆڵەکە ڕوناکتر دەبێتەوە، و ڕوناکتر بوونی هۆڵەکە مانای زیادبوونی ئاستی ئیمانە، یان ئەگەر زۆرترین گڵۆپ بکوژێنینەوە هۆڵەکە زۆر تاریکتر دەبێت کە ئەمەش نمونەیە بۆ ئەو مرۆڤانەی کە زۆر تاوان ئەنجام دەدەن و ئیمانیان زۆر لاواز بووە، یان ئەگەر زۆرترین گڵۆپ بە کراوەیی بپارێزین ئەوە هۆڵەکەمان زۆر بە درەوشاوەیی بۆ دەمێنێتەوە کە ئەمەش نمونەیە بۆ ئەو مرۆڤانەی کە زۆر موتەقی و لە خواترس و دیندارن، کە مانەوەی ئەم گڵۆپانەش بە درەوشاوەیی مانای مانەوەی ئیمانیانە بە بەهێزی، جا ئەگەر هەموو گڵۆپەکان بکوژێنینەوە هۆڵەکەمان بەتەواوی تاریك دادێت ئەمەش بەو مانایەی کە ئەگەر مرۆڤ هەتا مردن هیچ عملێکی نەبێت کە ئەمری اللەی پێ جێبەجێ بکات ئەوە ئیمانەکەی سفر دەبێتەوە وە بە کافری دەگەڕێتەوە لای اللە، بەڵام ئەگەر هۆڵەکەمان بە درەوشاویی هێشتەوە، لەناکاو بچین ئەمپێری کارەبای هەموو بیناکە بکوژێنینەوە ئەوە بە یەکجار هەموو گڵۆپەکان دەکوژێنەوە و هۆڵەکە تاریك دادێت سەرەڕای مانەوەی پلاکەکان بە کراوەیی، ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە ئەگەر مرۆڤ ئامادە نەبێت تەسلیم بە ئەمرێك لە ئەمرەکانی اللە ببێت بە عەمەل یان ئامادە نەبێت پابەند ببێت بە ئەمرەکانی اللەوە بە گوێڕایەڵی کردنی اللە لە جۆری دووەمی عەمەل بەو جۆرەی کە بڵێت ئامادە نیم تەرکی خواردنەوەی مەشروب بکەم سەرەڕای ئەوەی دەشزانم حەرامە جا تەنها بە تەرککردنی ئەم عەمەلە ( کە ئەم عەمەلەش پابەند بوونە بە اللەوە بە گوێڕایەڵی کردنی) کافر دەبێتەوە، ئەوە وەکو کوژاندنەوەی ئەمپێرەکە وایە کە دەبوە هۆی کوژاندنەوەی گڵۆپەکان و تاریك

هەڵگەڕانی هۆڵەکە، جا مەشروبخۆرەکە پێشتر سەرەڕای ئەوەی کە مەشروبیشی بخواردبا وەکو کوژاندنەوەی گڵۆپەکانی ناو هۆڵەکە وابوو بەرە بەرە هۆڵەکە تاریکتر دەبوو. واتا بەرە بەرە بە خواردنی مەشروب ئیمانی کەسەکە لاواز دەبوو بەڵام سەرەڕای ئەمە هۆڵەکە هەر بە ڕوناکی دەمایەوە واتە مرۆڤەکە هەر بە موسوڵمانی دەمایەوە، بەڵام کە چوو لە بنەڕەتدا ئەمپێرەکەی کوژاندەوە یەکسەر هۆڵەکە تاریك هەڵگەڕا، ئەمە وەکو ئەوە وایە کە بڵێت من ئامادەنیم تەرکی مەشروب خواردنەوە بکەم، ئامادە نیم پابەندی ئەم ئەمرەی الله ببم کە داوام لێ دەکات تەرکی مەشروب بکەم سەرەڕای ئەوەی کە دەشزانم مەشروب حەرامە، بەڵام هەر کافر دەبێتەوە و ئەو إقرارەی بە زمان هیچ سودی پێ ناگەیێنێت، جا ئەگەر سەرنج بدەین ئەگەر مرۆڤ تەنها لە یەك عەمەلیشدا ئامادە نەبێت پابەند ببێت بە اللەوە ئەوە هەر کافرە سەرەڕای إقراری قەلبی و قەولیش بەوەی کە تەرکی کردووە، ئەمەش وەکو ئەوە وایە کە ئەمپێرەکەمان دەکوژاندەوە هۆڵەکە تاریك هەڵدەگەڕا سەرەڕای ئەوەی پلاکەکان کراوە بوون، کەواتە معریفەی قەلبی و إقراری قەولی بەبێ عەمەل بێ سوودە هەروەکو چۆن مانەوەی پلاکەکان بە کراوەیی بێ سوود بوون پاش کوژاندنەوەی ئەمپێرەکە،

جا بەڵێ جۆری دووەمی عەمەلیش بەشێکی دانەبڕاوە لە ئیمان، بەوجۆرەیە کە ئەنجامدانی سەرپێچی لەو ئەمرانەی کە تەواوکەری ئیمانن نابێتە هۆی کافر بوونەوە، بەڵام پابەند بوون و پابەند نەبوون بە گوێڕایەڵی کردنی ئەو ئەمرانەی کە تەواوکەری ئیمانن، دەچێتە ژێر باری شرطی صحە یان بە کوردیەکەی مەرجی هێنانی ئیمان، بۆ نمونە ئەنجامدانی زینا نابێتە هۆی کافر بوونەوە بەڵکو دەبێتە هۆی لاوازکردنی ئیمان، بەڵام ئەگەر بگوترێت یان نیەتی دڵی وابێت کە (پابەند نەبێت بە اللەوە بە تەرککردنی زینا واتە

بڵێت: من بە گوێی الله ناکەم و بە هەمیشەیی زینا دەکەم ئامادە نیم گوێڕایەڵی الله بکەم سەرەڕای ئەوەی دەزانم کە زینا حەرامە و ئینکاری لە حەرامیشی ناکەم) ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت هەر کافرە، چونکە لێرەدا إعتقادی هەبوو کە زینا حەرامە وە بە قەولیش إقراری پێدەکرد کە زینا حەرامە بەڵام عەمەلی بە حەرامکردنی زینا نەدەکرد لەسەر نەفسی خۆی و بە عەمەل تصدیقی إعتقادە قلبیەکەی و إقرارەکە لەفزیەکەی نەکرد، کەواتە لێرەدا ئیمانەکەی نەهێناوە و کافرە چونکە کۆدەنگی هەیە کە إعتقادی بێ تەسلیم بوون و بێ إنقیاد، کوفرە بە الله، کە لە خوارەوە بەڵگەکان دانە بە دانە لە سەلەف و خەلەفەوە دادەنێین کە ئیمانی بێ عەمەل هیچ بوونی نیە و نەهاتووەتە جێ.

## ئەم بابەتەمان پەیوەندی چییە بە یاسادانان و تەشریعەوە؟

پێش ئەوەی بچینە سەر هێنانەوەی بەڵگەکانی زانایان لەسەر ئەوەی ئیمان بەبێ عەمەل وجودی نیە کە چ اعمالی شرطی صحە بن یان اعمالی شرطی کمال بن(بەو جۆرەی کە باسمان کرد)، با بزانین ئەوەی لەسەرێ باسمانکرد چ پەیوەندی بە یاسادانانی حاکمەوە هەیە کە یاسا دادەنێت.

وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، کە یاسادانان بریتیە لە دەرکردنی کۆمەڵە یاسایەکی پابەند کراو کە دەسەڵاتێکی تەشریعی دایاندەنێت کە لەلایەن دەوڵەتەوە دیاری کراون، کە ئەم دەسەڵاتە تەشریعیە ئەمر دەکات بە دەسەڵآتی تنفیذی جێبەجێکار، کە ئەم یاسایانەی کە دەرکردووە، پابەندیان بکات بەسەر هەموو لایەکدا بێ جیاوازی وە هەرکەسیش لەم یاسایانە لابدات و پێشێلیان بکات، ئەوە بەپێی ئەو سزایەی بە ئارەزووی دەسەڵاتی تەشریعی دیاری کردووە سزا دەدرێت.

ئینجا الله تعالی لە ڕێگەی رسول اللەوە صلی الله علیه وسلم، شەرعێكی دیاریكراوی بۆ دابەزاندووین بۆ ئەوەی تطبیقی بكەین، چ ئەمرێك بێت كە مرۆڤەكان لەسەر نەفسی خۆیان یان دەوروبەریان تطبیق بكەن یان چ نەهیەك بێت كە نەفسی خۆیان یان دەوروبەریان بپارێزن لە ئەنجامدانی، ئینجا ئێمە لەسەرەوە سەلماندمان كە ئەو ئەمر و نەهیانە دەبێت بە عمل تطبیق بكرێن، سەرپێچیش لەم ئەمر و نەهیانەدا تاوانە بە الله(ئەگەر عمەلەكە كوفری نەبوو) تاوان و معصیەتە، بەڵام وەكو گوتمان ئەگەر مرۆڤ نەفسی خۆی مەنع بكات لەوەی گوێڕایەڵی بۆ ئەمر و نەهیەكانی الله یان ئەمر و نەهیەكی الله لەسەر نەفسی خۆی پەك بخات و بە عمل تصدیقی ئیمانەكەی نەكات ئەوە كافر دەبێتەوە، ئیتر چ لە یەك ئەمر و نەهی دیاریكراو بێت یان لە چەند دانەیەكدا بێت، كەواتە ئەو حاكم و لیژنانەی كە دەسەڵاتی یاسادانانیان لە ژێر دەستدایە دەبێت لەو ئەمر و نەهیانەی كە الله دیاریكردوون بۆ مرۆڤەكان و بە بەڵگەی ئایەت و حەدیس و إجماع چەسپێندراون و معلوم من الدین بالضرورەن دەبێت ئەم ئەمر و نەهیانە لەم دەستووردا بچەسپێنێت، ئەگەر نەیانچەسپاند ئەوە عملیان لەو إعتقاد و قەولەیان دەركردوە كە إقراری پێ دەكەن، واتە **هەر یاسایەك لە دەستووردا چەسپا مانای ئەوەیە كە ئەو یاسایە دەبێت لەو كاتەوەی كە بڕیاری لەسەر دەردەچێت تطبیق بكرێت و غەیری ئەوە پەكدەخرێت و بەهیچ شێوەیەك جێبەجێ ناكرێت و حسابی بۆ ناكرێت**، كەواتە ئەگەر لیژنەی دەستوور بە یاسا نوسیەوە كە مەشرووب خواردنەوە لە وڵاتدا قەدەغەیە، ئەوە واتای ئەوەیە كە هیچ كەس لەو وڵاتەدا بۆی نیە مەشروب بخواتەوە، كە ئەوەی خواردیەوە ڕوبەڕویی ئەو سزایە دەبێتەوە كە دەستوور بۆی دیاری دەكات كە ئەگەر جەڵد لێدان بێت كەواتە لێرەدا دوو جار تصدیقی إعتقاد و قەولەكەیان كرد و ئیمانەكەیان چەسپا، جارێك

بەوەی كە مەشروب خواردنەوەی قەدەغە كرد، جارێك بەوەی كە حەدی الله ـی لەسەر مەشروب خۆر تطبیق كرد، بەڵام ئەگەر لیژنەی دەستوور بە یاسا نوسیەوە كە هەركەس لە وڵاتدا مەشروب بخواتەوە ئەوە هیچ حوكمێكی نیە، وە هەركەسیش لە كاتی مەشروب خواردنەوەدا ئیزعاجیان بكات و لێیان تێك بدات ئەوە سزا دەدرێت، وە ئەم یاسایەش تەسلیمی دەسەڵاتی تنفیذی و جێبەجێكار دەكات بەوەی كە ئەو یاسایە بە تەواوی بەسەر دانە بە دانەی هاوڵاتیانی وڵاتدا بسەپێنێت وە هەر كەسیش ڕێگری یان پێشێلی ئەو یاسا داڕێژراوە بكات ئەوە ڕووبەڕوی ئەو سزایە دەبێتەوە كە یاسا بۆی دیاری دەكات، كەواتە ئەم یاسا نوێیە كە دەردەكرێت مانای ئەوەیە كە بێجگە لەم یاسایە هیچی دیكە تطبیق ناكرێت و غەیری ئەوە پەكخراوە و هیچ حسابێكی بۆ ناكرێت لە ڕوی جێبەجی كردنەوە، كەواتە لێرەدا لیژنەی دەستور و حاكم ئەگەر گریمان بە إعتقادیش باوەڕیان بە حەرامی مەشروب هەبوو وە بە قەولیش گوتیان مەشروب حەرامە بەڵام بە عمل نە بەسەر خۆیاندا نە بەسەر هیچ هاوڵاتیەكی وڵاتیاندا حەرام نەكرد، ئەمە لێرەدا معریفە بە إعتقادی قەلب و إقراری بە قەول هیچ سودێكیان پێ ناگەیێنێت ئەگەر بە عمل تطبیقی نەكەن، ئەم تطبیق نەكردنەش وەكو سەرپێچیەك نیە! كە ئەگەر سەرپێچی الله ـی تێدا بكەن ئیمانیان كز و لاواز ببێت، ئەم تطبیق نەكردنە بەو جۆرەیە كە خۆیان و خەڵكیان مەنع كردووە لە تەسلیم بوون بە ئەمری الله ـوە بە عەمەل، وە ئامادە نەبوون پابەند ببن بە الله ـوە بە گوێڕایەڵیكردنی ئەمرەكانی، چونكە بە یاسا گوتویانە كە مەشروب خۆر هیچ سزایەكی نیە، خۆ ئەگەر بە یاساش بنوسنەوە (كە ئێمە دەزانین الله حەرامی كردووە وە یەقینیشمان هەیە بەمە بەڵام جێبەجێی ناكەین نەك لەبەر ئەوەی بەلامانەوە درۆیە یان یاسای خۆمان بە باشتر بزانین یان بە جائیزی بزانین، بەڵام حەزمان لێیە كە مەشروب

بخۆینەوە و پابەندی ئەمری الله نەبین)، ئەمە لێرەدا هەر ئیمانەکەی بەجێ نەهاتوە و هەروەکو گوتمان و لە خوارەوەش دەیسەلمێنین کە إعتقادی قەلبی و إقرار بە زمان هیچ مانایەکی نامێنێتەوە ئەگەر بە عمل تصدیق نەکرێن، واتە ئەگەر خۆی مەنع بکات لە تەسلیم بون بەو عەمەلەوە کە الله ئەمر و نەهی پێ و لێ کردووە!

کەواتە ئەو حاکمانەی کە یاسا دادەڕێژن پێچەوانەی شەرعی الله وە کە لە پابەندی بە شەرعی الله ـوە دەردەچن و واز لە گوێڕایەڵی شەرعی الله دەهێنن و بە یاسا پێچەوانەی شەرعی الله ئەمر و نەهی و حەرام و حەڵاڵ بۆ خەڵکی دیاری دەکەن کە با نەشیدەنە پاڵ الله با خۆشیان بە تاوانبار بزانن با بە إعتقاد و بە قەولیش إقرار بە ئەمری الله بکەن، بەڵام مادەم بە عمل خۆیان لە پابەند بوون لە ئەمری الله ـوە دەرکردووە ئەوە کافر و طاغوت و موشریك و هاوبەشدانەرن بۆ الله، کە حاشا نە قەولەکەی إبن عباس نە إجماعی سەلەف نە ڕای هیچ زانایەیەك لەسەر بابەتی حوکم نەکردن کە گوتویانە حاکم ئەگەر حوکم نەکات بە حوکمی الله بەهۆی ڕەشوەیەکەوە یان بەهۆی خزمایەتیەکەوە یان شەهوەتەوە ئەگەر خۆی بە تاوانبار زانی کافر نابێتەوە، حاشا ئەمە لەسەر یاسادانان و دەرهێنانی عەمەل لە ئیمان نییە و ئەو یاسادانانەی کە بە یاسا شتێك دادەنێن پێچەوانەی شەرعی الله و حوکم و ئەمرەکانی الله پەکدەخەن و عملی خۆیان پێش دەخەن بۆ حوکم کردن تاوەکو حوکم و ئەمری الله، ئەمانە کافر و طاغوتن وەلەو خۆشیان بە تاوانبار زانی و إقراریان بە حوکمی الله کرد، مادەم خۆیان مەنع کرد لە عەمەل پێکردنی ئەوە کافرن، وە کەس ئەمانە بە موسوڵمان نازانێت ئیلا موڕجیئە و جەهمیەکان نەبێت، وە ئەمە گەورەترین بوختان و خیانەتە لە إبن عباس و سەلەف رحمهم الله کە گوایە ئەو یاسادانانەیان بەکوفر نەزانیوە کە یەك دانە حاکم لە زەمەنی ئەواندا

نەبووە کە بە یاسا پێچەوانەی دینی الله یاسا دابڕێژرێت و ئەمانیش بڵێن ئەوە کوفری بچوکە!!!!! حاشا حاشا حاشا ئەمە عقیدەی ئەهلی سونە نەبوە و ناشبێت، وە بۆیە بە موتڵەقیش گوتویانە حکم نەکردن بە حوکمی الله کوفری بچوکە چونکە لە زەمەنی ئەواندا حاکمەکان لە دەستوورەکانیاندا یاساکانی اللەیان چەسپاندبوو و بێجگە لەوە و پێچەوانەی ئەوە هیچی دیکەیان نەدەچەسپاند بەڵام لە جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانەدا جار جار کەمترخەمیان کردبا و تەرکیان کردبا و جێبەجێیان نەکردبا لە کاتێکدا دەیانزانی تاوانبارن و بە دەمیش ئەمەیان دەگوت کە تاوانبارن، ئەمە بەم حوکم نەکردنەیان ئیمانیان کز و لاواز دەبوو وەکو هەر تاوانێکی دیکە وە کافر نەدەبوون، وە بۆیەشە سەلەف رحمهم الله دەیانبەستەوە بە إعتقادەوە، ئەگینا بە تەحەداوە یەك حاكممان لەو مێژوەدا بۆ بهێنن کە بە یاسا پێچەوانەت شەرعی الله یاسای داڕشتبێت و سەلەف گوتبێتیان کوفر بچوکە!، بەڵام وەکو داستان محمد مەچن نمونەی معاویەمان بۆ بهێننەوە کە گوایە رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: موسوڵمان نە میرات لە باوکی کافرەوە وەردەگرێت نە میراتیش دەدات بە کوڕی کافر، کە بڵێن معاویە هەستا پێچەوانەی ئەمە ئەمرێکی دەرکرد کە گوایە کوڕی موسوڵمان دەتوانێت میرات لە باوکی یەهودی و نەسڕانیەوە وەربرگرێت، ئەم نمونە هێنانەوەیە خیانەتە لەم دینە پاکە، خیانەتە لە ئایەتەکانی قورئان، خیانەتە لە أحادیثی رسول، خیانەتە لە سەلەف، چونکە ئێمە کە باسی یاسادانانمان کردووە یان باسی خۆ مەنع کردن لە تطبیق کردنی ئەو ئەمر و نەهیانەمان کردووە کە الله تعالی ئەمرمان پێ دەکات، مەبەستمان لەو حوکم و ئەمرانە بووە کە بە ئیجماع و بێ جیاوازی کۆدەنگیان لەسەر هەبووە و معلوم من الدين بالضرورەن وەکو حەرامی مەشروب و زینا و دزی و واجببونەی حیجاب، بەڵام بە بابەتی میرات سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی

زانایان ڕایان وایە كە نە میرات لە كافر دەبرێت نە پێی دەدرێت ئیتر چ لە ئەهلی كیتاب بێت یان كافرەكانی دیكە، بەڵام حەتتا پێش معاویەش سەحابی هەبووە كە گوتویانە موسوڵمان میرات لە باوكی غیر محاربی ئەهلی كیتاب دەبات، كە ابن حزم لە المحلی ـدا باسی دەكات كەمعاذی كوڕی جبل و محمدی كوڕی علی و چەندانی دیكە رحمهم الله ڕایان وایە موسوڵمان میرات لە بابی غیر محاربی ئەهلی كیتاب دەبات، كەواتە ئەم بابەتە سەرەڕای ئەوەی كە زۆربەی سەلەف و زانایان گوتویانە كە میرات نە لە باوكی كافر دەبرێت نە دەدرێت بە كوڕی كافر بەڵام هەندێكیان بەو جۆرە تێگەشتوون كە باسمان كرد، كەواتە إجتهادیان كرد بەڵام نەیانپێكاوە و یەك ئەجریان هەیە، خۆ ئەگەر بە قسەی گومڕاكان بێت كە استدلال بەم فعلەی ئیمامی معاویەوە دەكەن بۆ بە كافر نەبوونەوەی یاسادانەر، كە دەڵێن بۆچی معاویە یاسای دانا و كافریش نەبووەوە، بە قسەی ئەوان بێت معاویە لە دوو شت دەرناچێت:

یەكەم: یان ئەوەتا معاویە لەم یاسایەیدا كە پێچەوانەی حەدیسەكەی رسول صلى الله عليه وسلم دایڕشتووە خۆی بە تاوانبار زانیوە و لەبەر شەهوەت ئەم یاسایەی داڕشتوە بە إعتقاد خۆیی بە تاوانبار زانیوە، و بە قسەی ئەوان بێت كە یاسادانان كوفر نیە و كوفری بچوكە ئیمامی معاویە كوفری بچوكی كردووە، كە ئەمەش سوكایەتی كردنە بە سەحابە و هاوەڵان، كە لە سەدا سەد خاڵی یەكەم نیە، چونكە معاویە ئەم إجتهادەی وەكو سەرپێچیەك نەكرد و تا خۆیی بە تاوان بار بزانێت، بگرە وەكو إجتهادێك كردی و بە إعتقاد باوەڕی بەو إجتهادەی بوو.

دووەم: یان ئەوەتا موعاویە بە إعتقاد باوەڕی بە ڕاستی ئەم "یاسایەی بوو كە پێچەوانەی رسول دایڕشت"، كە بە قسەی ئەوان هەركەسێك بە إعتقاد شتێكی بە حەرام زانی كە الله حەلالی كردبوو یان شتێكی بە حەلال زانی كە

الله حەرامی كردوە كافرە، كەواتە بە قسەی ئەوانە بێت موعاویە كافر بوەتەوە چونكە بە واقعی موعاویە بەو كەسەی گوت كە هات بۆ لای و گوتی بە معاویە: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێمە بۆیە موسوڵمان نابین چونكە باوكمان ئەهلی كیتابە و رسول اللەش صلی الله علیه وسلم دەفەرمێت كە موسولمان میرات لە كافر نابات، موعاویەش پێی گوت: **ئێمە میرات لەوان دەبەین**(ئەهلی كیتاب) **بەڵام ئەوان لە ئێمەی نابەن**، تەواو كە ئەمەشی وەكو إعتقادی خۆی گووت نەوەك ئەوەی كە بڵێت قەیناكە تۆ میراتەكە ببە و لەولاشەوە خۆی بە تاوانبار بزانێت، بگرە موعاویە ئەمریشی كرد بە هەموو والیەكان كە ئەم حوكمە تطبیق بكەن، كەواتە إعتقادیشی بەو حوكمەی هەبوو، بە قسەی داستانیە مورجیئەكان بێت موعاویە كافرە، پەنا بە الله، جا با ڕاستگۆ بن لەگەڵ عەقیدەی خۆیان، یان ئەوەتا بگەڕێنەوە سەر عەقیدەی ئەهلی سونە یانیش ئەوەتا معاویە تكفیر بكەن.

كەواتە خوشك و برای موحد، وریا بن كە دەڵێین یاسادانان پێچەوانەی حوكم و ئەمر و نەهیەكانی شەرع كوفرە مەبەستمان لەو حوكم و ئەمر و نەهیانەیە كە كۆدەنگی و إجماعیان لەسەرە كە حەرام یان حەلال یان فەرز بن، واتە معلوم من الدین بالضرورة بن، نەوەك ئەو بابەتانەی كە إجتهادین و خیلافیان لەسەر بووە یان ناوە ناوە خیلافیان لەسەر هەبووە سەرەرای ئەوەی كە زۆربەی زانایان یەكلایان كردبێتەوە. جا وریابن یاسادانان وەكو ئەوە وایە كە ئەمپێرەكەمان دەكوژاندەوە و كارەبای بیناكە دەكوژایە و هۆڵەكە تاریك هەڵدەگەڕا و ئیمانەكەمان نەدەما و كافر دەبووین سەرەڕای ئەوەی پلاكەكان بە كراوەیی دەمانەوە واتە سەرەڕای ئەوەی بە إعتقاد و بە قەول إقرار بە حوكم و ئەمری الله بكەین، چونكە كە یاسایەك دابڕێژین پێچەوانەی شەرع واتای ئەوەیە كە بە عەمەل ئەو ئەمر و نەهی یان فەڕزانەی كە الله بۆمانی دیاریكردوە لەسەر خۆمان یان

ژێردەستەكانمانی پەك دەخەین و عەمەلمان لە إعتقاد و قەول دابڕیەوە كە ئەمەش نەمانی ئیمانە.

جا خوشك و برای موحد دووبارە وریا بن، كە داستانیە موڕجیئە و جەهمیەكان هەڵمان نەخەڵەتێنن بەوەی كە بڵێن هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان حەدە شەرعیەكان و ئەمرەكانی دیكە، بۆ نمونە دەڵێن: چ جیاوازی هەیە لە نێوان جێبەجێ نەكردنی حەدی مەشروبخۆر و مەشروب خواردنەوە، دەڵێن بۆ یەكەمتان بەلاوە كوفرە دووەمتان بەلاوە كوفر نیە؟

جا ئەم شوبهانەیان وەكو ژەهر وان زۆر زوو كاریگەری خۆیان لەسەر ئینسانی موحد دەكەن ئەگەر ئینسانی موحد وریاو ئاگاداری خۆی نەبێت بەم گومانە باطلانە بابەتەكەی لێ دەشێوێنن و لێی لێڵ دەكەن، پاشانیش وەكو چەند برایەك دەگێڕنەوە بەو كەسەی كە ئەم شوبهانەیان لە دڵدا چاندووە دەڵێن: "نزیكی ئەو خەواریجانە(یانی موحدان) مەكەوەرەوە ئەوانە گومڕان شوبهە لە دڵتدا دەچێنن"، یانی ئەوەندە لێزانن ژەهرەكەی خۆیان دەڕێژن پاش خستن و داڕوخاندنی عەقیدەی ئینسانی موحدی پێ هەڵدەخەڵەتێنن و پاش ئەمە ڕێك وای لێ دەكەن كە نەچێت و نەگەڕێت و پرسیار نەكات و لێی نەكۆڵێتەوە بزانێت ئەم بابەتە چۆنە، بەوەی یەكسەر إطمئمانێكی وەهمی لە دڵی ئەو كەسەدا دروست دەكەن كە ئەم ژەهرانەی لە ناخدا دەڕێژن بەوەی كە پێی دەڵێن: "تۆ باشتر دەزانیت یان إبن عباس؟ تۆ باشتر دەزانیت یان سەلەف؟" یەكسەر كەسی ژەهر لە ناخدا ڕژێندراو بەم قسانە دەڕوخێت و دەچێتە سەر ڕایە باطلەكەی ئەوان و بەم إطمئنانە وەهمیەوە یەكسەر خود بە خودی دڵنیاییەك لە دڵیدا دروست دەبێت بەوەی كە سەلەف كە بە موتڵەقی تكفیری حاكم بغیر ما انزل الله یان نەكردووە كەواتە سەلەف تكفیری یاسادانەریان نەكردووە، وە ئەم دڵنیاییە خەیاڵییە دەستكردە وای لێ دەكات نەچێت بە شوێن ئەم بابەتەدا

و پرسیار لە ئەهلی ئەم بابەتە نەکات بزانێت حەقەکە چییە، جا خوشکان و برایانی موحد ئێمە کە گوتومانە یاسادانان کوفرە مەبەستمان لە دانانی هەر یاسایەك پێچەوانەی هەر ئەمر و نەهیەك یان حەرام و حەڵاڵێك یان فەرزێکی ئەم دینەیە نەوەك تەنها حەدەکان، ئەم شوبە باطڵە بۆ دروستکردنی وەسوەسە لە دڵی موحددا دروستکراوە، چونکە ئەگەر حاکمێك یاسایەك دابڕێژێت تیایدا چ ئەمرێکی الله پەکبخات وەکو قەدەغە کردنی حیجاب یان چ حەدێك لە حەدەکان پەك بخات وەکو لابردن و دفع کردنی حوکمی دەستبڕینی دز و دانانی یاسایەکی دەستکرد و دانراو لەباتی ئەوە، هەر کافر دەبێتەوە بە الله، نەك کافر دەبێتەوە بگرە خۆی کردووە بە خوایەك بۆ ئەوەی خەڵکی بیپەرستن بەوەی سوڵتەی تەنفیذی ئەمرەکانی تطبیق دەکەن و خەڵکیش حوکم دەبەنەوە بۆ لای ئەم یاسا دانراوانە لە باتی یاسا و حوکمی الله تعالی.

کەواتە نەك ئەو عەمەلانەی کە خودی عملەکە کوفرین وەك جنێودان بە الله، تەنانەت ئەو عەمەلانەشی کە تەواوکەری ئیمانن پەکخستنیان و لابردنیان و مەنع کردنی نەفس بە تەسلیم بوون پێیانەوە کە الله ئەمری پێکردوون، کوفرە بە الله، جا شوبهەیەکی دیکە هەیە کە دروست دەکرێت ئەویش ئەوەیە دەڵێن: "باشە ئێوە کەسێك کە تاوانی زۆر ئەنجام دەدات لە کبائرەکان بە کافر نازانن لە کاتێکدا ئەگەر بە توندیش دەستی گرتبێت بە ئەنجامدانی کبائرەکانەوە ئەگەر خۆی بە تاوانبار زانی، ئەی چۆن حاکمێك بە کافر دەزانن کە بە توندی دەستی گرتووە بە سەرپێچی الله لە حوکمکردنیدا و یاسادادەنێت و بە توندی جێبەجێیان دەکات لە کاتێکدا خۆی بە تاوانبار دەزانێت؟"

لە وەڵامدا دەڵێین: ئێمە ئەو کەسەی کە بە توندی دەستی گرتووە بە ئەنجامدانی کبائرەکانەوە و تاوان ئەنجام دەدات بە کافر نازانین ئەگەر

خۆیی بە تاوانبار زانی، بەڵام ئەو کاتە تکفیری دەکەین کە نیەتی دڵی وابێت یان ویستی وابێت کە بە هیچ جۆرێك پابەند نەبێت بە ئەمرێك یان ئەمرەکانی اللەوە بەوەی بڵێت من گوێڕایەڵی الله ناکەم، ئەمە کافرە ئەگەر إقراریش بە ئەمرەکانی الله ـوە بکات بە زمان و بیشیزانێت بە إعتقاد، وە ئەم کافرەی کە پابەند نییە بە الله ـوە بەوەدا لەو کەسە جیا دەکەینەوە کە تاوان ئەنجام دەدات لە کاتێکدا پابەندە بە الله ـوە، کە پابەند نەبووەکە بە قسەیەکی خۆی یان بە نیشانەیەك نیەتی دڵیمان بۆ دەربکەوێت کە دەستگرتنی بە ئەنجامدانی کبائرەکانەوە لە تەسلیم نەبون بە ئەمری الله ـوە سەری گرتووە نەوەك تەنها لە شەهوەتەوە سەری گرتبێت، لەکاتێکدا سووربوو لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکان بە تاوانبار دەزانین نەوەك کافر چونکە نیشانەیەکمان بۆ دەرنەکەوتوە کە بیسەلمێنێت بۆمان کە ئەمە لە ئەنجامی خۆ مەنع کردن لە تەسلیم بوون بە الله ـوە ئەو تاوانانە ئەنجام دەدات.

جوانتر ڕوونی بکەمەوە، ئەو کەسەی کە کبائرەکان ئەنجام دەدات ئەگەر بۆمان بەیان و ڕوون ببێتەوە کە ئەم کەسە بەهۆی پابەند نەبوونەوە بە هیچ جۆرێك بە الله ـوە و قبوڵ نەکردنی گوێڕایەڵی الله ـوە ئەم تاوانانە ئەنجام دەدات ئەوە حوکمی لەسەر دەدەین بە کوفر، نمونەشمان بۆ ئەمە زەکات نەدەرەکانی زەمانی ئیمامی ئەبوبەکرە رضي الله عنه، کە بۆ هاوەڵان بەیان بوو کە ئەم مورتەدانە نایانەوێت بە هیچ جۆرێك زەکات بدەن سەرەڕای ئەوەی جەحدی زەکاتیشیان نەدەکرد، بەمە تکفیر کران و قیتال کران و بە طائفەی ممتنعة (خۆ مەنع کەر) ناو بران تاوەکو گەڕانەوە بۆ زەکات دان، لە کاتێکدا بە حدیثی صحیح دەیسەلمێنین کە خودی زەکات نەدان کوفر نییە، بەڵام ئەو کەسانەی کە کبائر ئەنجام دەدەن نە لە پابەند بوون لە الله ـوە دەردەچن نە ئامادەن تەرکی گوێڕایەڵی الله بکەن و قۆڵ

هەڵماڵن لە ئەنجام دانی کبائرەکان بێ هیچ حسابێك بۆ ئەمری الله، ئەمانە کافر نین و تاوانبارن.

جا حاڵی حاکم و یاسادانەر کە یاسا دادەنێن جیایە لە حاڵی تاك چونکە حاکم و سەرۆکی وڵات پێویستی بە بەرنامەیەکی دیاریکراوە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، واتە ناکرێت حاکم هەر ڕۆژە و بە هەواو هەوەسی خۆی و بە ئارەزووی خۆی حوکمێك بەسەر کەسێکدا بدات و ڕۆژێکی دیکە لە هەمان کەیس حوکمێکی جیاواز بدات، کەواتە حاکم پێویستە بەرنامەیەکی کاری لە ژێر دەستتا بێت و هەموو شتێك و هەموو یاسایەك و هەموو سزایەکی تێدا دیاریکرابێت و بەو یاسا و بەرنامەیە حوکم بەسەر خەڵکیدا بدات، ئیتر ئێمە حاکمێکی تاوانبارمان نیە کە موسوڵمان بێت و بە توندی دەستی گرتبێت بە پێچەوانە کردنی ئەمری الله هەروەکو چۆن مرۆڤە تاوانبارەکە بە توندی دەستی گرتبوو بە ئەنجامدانی تاوانەوە، کەواتە حاڵی حاکم دووجۆرە:

یەکەم: یان ئەوەتا ئەو بەرنامەی کارەی لەبەردەستی حاکمدایە لە قورئان و سونەتەوە وەری گرتووە و تاکە سەرچاوەی یاسادانانی قورئان و سونەت بوو و قورئان و سونەتی لە ناو ئەو دەستوورەیدا کرد بە حاکم بەسەر خەڵکیەوە، (سەرەڕای ئەوەی لە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەدا جار جار کەموکوڕی هەبێت و لەبەر ڕەشوە و خزمایەتی و شەهوەت جار جار حوکم جێبەجێ نەکات بە مەرجێ خۆی بە تاوانبار بزانێت و ئەو حوکمەی کە نەیکردووە لە دەستووردا لانەدات و لە حوکم کردن پەکی نەخات و دووری نەخاتەوە)، ئەم حاکمە لێرەدا موسوڵمانە و لە وەلی ئەمری موسوڵمانانە سەرەڕای ئەوەی کە تاوانبارە.

دووەم: یانیش ئەوەتا حاکم لەو بەرنامەی کارەی کە لە بەردەستیەتی یاسایەك یان چەندین یاسا دادەڕێژێت کە پێچەوانەی شەرعی الله ـن، وە لایەنی تەنفیذی پابەند دەکات کە خەڵکی مولزەم بکەن بەم یاسایانەوە و وا لە خەڵکی بکەن حوکم بهێننەوە بۆ ئەم یاسایانە وە مەنعیان دەکات

لەوەی قورئان و سونەت بکەن بە حاکم لە نێوان خۆیاندا، کە ئەم حاکمە وەکو تاکەکەی سەرەوە بە توندی دەستی گرتبوو بە ئەنجامدانی تاوانەکانەوە کە کافر نەدەبوو سوور نیە لەسەر جێبەجێکردنی ئەم یاسایە و لەولاشەوە خۆی بە تاوانبار بزانێت و هەر پابەند بێت بە ئەمری اللەوە ، بگرە ئەم حاکمە ئەو یاسایەی کە دایڕشتووە، کردویەتی بە بەرنامەی کاری وڵات، هەروەکو لەسەریشەوە گوتمان کە ئەگەر **نیشانەیەکمان** لەو تاکەی (کە بە توندی دەستی گرتبوو بە ئەنجام دانی کبائرەکانەوە) بۆ دەربکەوێت کە ئەم کبائرانە بەهۆی (مەنع کردنی خۆیەوە بۆ تەسلیم بون بە ئەمرەکانی اللە ـوە ئەنجامبدات) ئەوە بە بینینی ئەم **نیشانانە**(ئیتر چ بە زمانی بوو چ بە دەرکەوتنی نیەتی بوو) ئەو کەسە تکفیر دەکەین چونکە بە عەمەلەکەی تصدیقی ئیمانەکەی نەکردووە، بۆ نمونە بە دەمی خۆی بڵێت من ئامادە نیم خۆم تەسلیم بکەم بەم ئەمرەی اللە ـوە سەرەڕای ئەوەی بە إعتقاد باوەڕم پێیەتی و بە زمانیش دانی پێدا دەنێم، ئەمە کافرە، جا ئەو **نیشانەیەی** کە لەسەرەوە پێی بۆمان دەردەکەوت کە ئەو تاکە ئامادە نیە ملکەچی اللە ببێت(ئیتر چ بە زمانی بوو چ بە دەرکەوتنی نیەتی بوو) لە یاسادانەردا زۆر بەڕوون و ئاشکرایی دیارە و وازحە و دەرکەوتوە کە نییەتی یاسادانەر لە دانانی ئەم یاسایەی پێچەوانەی شەرع بریتیە لە جێبەجێکردن و تطبیق کردنی بەسەر تاك بە تاك و دانە بە دانەی ژێردەستەکانیانەوە، وە دیارە کە بەتەمای چییە! جا حاڵی ئەم یاسادانەرەش کە پێچەوانەی شەرعی اللە یاسا دادەڕێژێت لە دوورەوە هاوار دەکات و ڕوونە، **کە مەبەست بەو یاسایەی کە دایڕشتووە بریتیە لە جێبەجێکردنی و پەکخستنی غەیری ئەوە،** ئەمەش هەمان ئەو خۆ مەنع کردنەیە لە تەسلیم بوون بە اللە، کە لەسەرەوە باسمان کرد کە بە عەمەل ئامادە نیە بە هیچ جۆرێك پابەند ببێت بە اللە ـوە بە گوێڕایەڵی کردنی هەموو شتەکانی، بۆ نمونە بە یاسا دەڵێت ژن و پیاو هەردووکیان یەك بەش دەبەن، ئیتر ئەمە واتای ئەوەیە

كە بە ئەم یاسایە تطبیق دەكرێت و ئەو ئەمرەی كە الله پێمانی كردووە (بەوەی ژن نیو بەشی پیاو بەرێت) بە هیچ جۆرێك تطبیق ناكرێت، كەواتە لێرەدا ئەگەر بە إعتقادیش باوەڕی بە ڕاستی و دروستی شەرعی الله هەبوو وە بە زمانیش إقراری بە شەرعی الله كرد، مادەم بە عەمەل نیەتی لێ هێناوە ( بە دارِشتنی یاسا) كە ئەو ئەمرەی الله بە هیچ شێوەیەك جێبەجێ نەكات بەسەر هیچ كەسدا ئەوە ئەم كەسە كافرە بە الله چونكە بە عەمەل تصدیقی إعتقاد و قەولەكەی نەكردووە و ئیمانی نەماوە و كافر بوەتەوە.

(تێبینی: بەڵام ئەگەر بە یاسا چەسپاندی كە ژن نیو بەشی پیاو دەبات بەهەمان ئەو جۆرەی كە ئیسلام ئەمری پێكردوە بەڵام لە جێبەجێ كردنیدا كەموكوڕی هەبێت ئەوە كافر نابێتەوە ئەگەر إعتقادی وابێت حوكمی الله حەقترە و تاوانبارە، جا لەبەر كەسێكی نزیكی وەكو زوڵمێك بەشێك یان زیاتر بدات بە ئافرەتێك تەنها وەكو زوڵمێك ئەمەی كردبێت نەوەك وەكو كردن بە یاسا و چەسپاندنی بەسەر هەموو خەڵكیدا بێ جیاوازی یان نەوەك وەكو بەباشتر زانینی ئەم كارەی خۆی لە ئەمرەكەی الله، ئەوە پێی كافر نابێتەوە و لە تاوانبارانە و ئیجماعی هەموو زانایان لە إبن عباسەوە تاوەكو كۆتاییەكانی خەلەفیش لەسەر ئەم حوكم نەكردنەیە نەوەك یاسادانان و كردن بە یاسا بەسەر خەڵكەوە بێ جیاوازی، چونكە ئەمەیان ئیمانی بێ عەمەلە كە ئیمانی بێ عەمەلیش وجودی نیە، وە هیچ كەس ئەم اجماعەی زانایان بەكارناهێنێت بۆ چەسپاندنی بەسەر یاسادانەر و مشرع بێجگە لە الله ئیلا موڕجیئە و جەهمیەكی كافر نەبێت)

وە ئەوەی جێگای ئاماژەیە لێرەدا ئەوەیە كە ئێمە هەموو ئەم كتێبەمان لەسەر ئەو حاكمانەیە كە یاسادادەڕێژن پێچەوانەی شەرعی الله و بە إعتقاد و بە قەول إقرار بە حوكمی الله دەكەن دان بە حەق و ڕاستی حوكمی الله دەنێن و خۆیان بە تاوانبار دەزانن بەڵام بە عەمەل بە هیچ جۆرێك حوكمی الله جێبەجێ ناكەن و حوكمەكانی الله ـیان بە تەواوی پەكخستوە، نەوەك لەسەر ئەو حاكمانەی كە جەحد و ئینكاری حوكمی الله دەكەن چونكە جەحد و ئینكاری حوكمی الله كوفرە ئیتر چ حوكم بكات بە قورئان یان نەیكات هەروەكو چۆن إبن القیم لە مدارج السالكین (٣٣٦/١) باسی دەكات، خۆ ئەگەر حاكم یاسای دارِشت پێچەوانەی شەرعی الله و لەگەڵ ئەمەشدا جەحد و ئینكاری شەرعی الله ــی كرد ئەوە كوفر بەسەر كوفردا كەڵەكە بووە و كوفرەكەی دووبەرامبەرە، جا وریا بن هیچ جیاوازیەك نییە

لە کافر بونەوەی ئەو حاکمەی کە یاسادادەڕێژێت و جەحدی حوکمی الله ناکات، لەگەڵ ئەو حاکمەی کە یاسا دادەڕێژێت و لەگەڵ ئەمەشدا جەحدی حوکمی الله دەکات، ئیللا جیاوازیەکەی لەوەدایە کە ئەوەی یەکەم یەك کوفری کردووە، ئەوەی دووەم دوو کوفری کردووە و کوفر بەسەر کوفردا کەڵەکە بووە و زیادە ڕۆیوە لە کوفردا.

ئەمە سەرەرای ئەوەی کە لە درێژایی مێژوودا یەك دانە حاکممان نەبینیوە بە تەحەداوە کە یاسایەك پێچەوانەی شەرع دابڕێژێت و یاساکەی الله ـ ی بە باشتر لە یاساکەی خۆی زانیبێت! ئیللا یاساکەی خۆی بە باشتر زانیوە لە حوکمی الله، بەڵام ئێمە گریمانەمان داناوە کە گریمان چاخێك لە چاخەکان ڕۆێك لە ڕۆژان سەدەیەك لە سەدەکان لە کون و سوچێکی ئەم جیهانەدا حاکمێك پەیدا بوو شتێکی ئەوهای کرد ئەوە هەر طاغوتە و ئەو إقرار بە زمان و إعتقادەی بە حوکمی الله هیچ سوودی پێ ناگەیێنن کە بە عەمەل حوکمی الله ـ ی پەکخستوە، بۆ ئەوەی مورجیئە و جەهمیە کافرەکان سەر لە موحدان تێك نەدەن بە شوبهەی باطڵ و ژەهری ڕژێنراو.

کەواتە پێش ئەوەی بچینە سەر هێنانەوەی ڕای زانایان لەسەر ئیمان و عەمەل، ئێستا بۆمان ڕوون بویەوە حاکم کە یاسا پێچەوانەی شەرع دادەڕێژێت بەمەدا دەزانین کە ئەمری الله بە عەمەل لە ئیش دەخات و لە پابەند بوون بە ئەمرەکانی الله و تەسلیم بوون بەو ئەمرانەوە بە عەمەل دەردەچێت، کە بە نەمانی عەمەلیش ئیمانیش نامێنێت، ئەمەش بۆ ئەوکاتەیە کە ئەگەر ئەو حوکمەی الله کە پەکی دەخات بە إعتقاد و بە قەول بە باشتری بزانێت لە حوکمی خۆی، بەڵام ئەگەر جەحد و ئینکاریشی بکات، ئەمە کوفر بەسەر کوفردا کەڵەکە بووە.

# ڕای زانایان لەسەر ئیمان و عەمەل وە پەیوەست كردنی عەمەل بە یاسادانانەوە

خوشك و برای موحدم، ئەوە بزانە كە پێویستە لەسەرمان بە إعتقاد و بە قەول و بە عەمەل پابەند ببین بە ئیسلامەوە بۆ ئەوەی ئیمان بهێنین، جا بۆ ئەوەی بێینە ناو ئیسلامەوە دەبێت بە إعتقاد و قەول باوەڕمان بە هەموو ئەو شتانە هەبێت كە رسول پێیەوە هاتوە، وە تصدیقی ئەمەش بە عەمەل بكەین ، جا ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە كە جەحد و ئینكاری شتێك لە ئیسلام پێچەوانەی دان نانە بەو شتە بە إعتقاد و بە قەول، واتە زانین و دانپێدانان بە إعتقاد و بە قەول دەكرێت بە پێچەوانەشەوە جەحد و ئینكاری هەر بە إعتقاد و قەول دەكرێت، وە تەسلیم و پابەند بوونیش بە اللە ـوە بە عەمەل دەكرێت وە بە پێچەوانەشەوە مەنع كردنی خود لە تەسلیم بوون و پابەند بوون بە اللە ـوە هەر بە عەمەل دەكرێت، كەواتە ئەگەر بە إعتقادی قەلبی معریفەت هەبێت و بە زمان إقرار بكەیت بە هەموو ئەوەی كە رسول پێیەوە هاتووە بەڵام بە عەمەل تەسلیم نەبیت پێی و بە هیچ جۆرێك ئەوە تطبیق نەكەیت كە رسول اللە پێیەوە هاتووە، ئەوە كەسێكی ممتنعیت(ڕێگریت دەكەیت لە نەفسی خۆت بەوەی پابەندی اللە ببیت) و ئیمانت نیە و كافریت وەكو زەكات نەدەرەكان كە زۆربەیان معریفەی قەلبی و إقراری قەولیان هەبوو بەڵام بە عەمەل خۆیان مەنع كرد بە تەسلیم و پابەند بوون بەم معریفە قەلبی و إقرارە قەولیە.

(تێبینی: ئەگەر بە قەلب و بە زمان جەحد و ئینكاری بكەیت بەڵام بە عەمەل تەسلیم ببیت ئەوە كافریت، بەڵام بە عەمەل تەسلیم ببیت و بە زاریش إقرار بكەیت بەڵام بە قەلب جەحد و ئینكاری بكەیت ئەوە وەكو مونافیقەكان وایت كە بە عەمەل و زمان خۆیان بە موسوڵمان پیشان دەدا بەڵام لە ناخەوە كافر بوون، جا ئەگەر بە قەلب و زمان جەحد و ئینكاری بكەیت و بە عەمەلیش تەسلیم نەبیت ئەوە كوفرەكەت توندترین و گەورەترینە.)

رسول الله صل الله علیه وسلم دەفەرمێت: "أتدرون ما الإيمان بالله وحده؟، قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وصيام رمضان وأن تعطوا من المغنم الخمس".

واتە: دەزانن ئیمان بە الله چییە؟ گوتیان: الله و رسولەکەی باشتر دەزانن، پاشان فەرمووی: هێنانی شەهادەتە بەوەی هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە بێجگە لە الله و وە محمدیش نێردراوی الله ـیە، وە نوێژکردنە، و دانی زەکاتە، و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانە، وە بەخشینی پێنج یەکی غەنیمەتە(بە بیت المال). (البخاری،٥٣)

بە ئیزنی الله دەڵێم: لەم حدیثەوە بۆمان دەردەکەوێت کە أعمال بەشێکی دانەبڕاون لە ئیمان، کە بەبێ أعمال ئیمانیش وجودی نییە، جا ئەگەر سەرنج بدەن ئەو پێنج شتەی کە باسکراوە تەنها سەرپێچی لە شەهادەت و نوێژ دەبێتە کوفر، سێ شتەکەی دیکە سەرپێچی تێیاندا کوفر نین، واتە خودی زەکات نەدان و ڕۆژوو نەگرتن و نەدانی پێنج یەکی غەنیمەت بە بیت المال وەکو نوێژنەکردن و نەهێنانی شەهادەت کوفر نین، بەڵام ئەگەر بچینەوە ناوەڕۆك، تەرکی ئەو سێ دانەی دیکەش دەبنە کوفر، بۆ نمونە ئەگەر یەکێك پابەند نەبێت بە الله ـوە بەوەی تا مردن ئامادە نەبێت زەکات بدات یان ڕۆژو بگرێت یان تا مردن سەدان جار غەنیمەتی دەست کەوێت ئامادە نەبێت پێنج یەکی ببەخشێت، ئەمە پابەند نەبووە بە الله وە ئیمانی نەهێناوە، چونکە تەرکی تەواوەتی عەمەلێکی کردووە، بۆیە بەم تەرکی جنسی عەمەلە کافر دەبێتەوە، (واتە بەو جۆرە نییە کە "تەرکی جنسی عەمەل لە ئیمان کەمبکاتەوە"، بەڵکو لە ڕاستیدا تەرکی جنسی عەمەل کوفرە با خودی سەرپێچی لەو عەمەلەی کە تەرکی تەواوەتی کردووە کوفر نەبێت)، جا ئەم سێ شتەش لە بنەڕەتدا هەر مەرجی ئیمانن بە نەبوونیان و تەرکی تەواوەتیان ئیمان نامێنێت، واتە ئەگەر کەسێك ئامادە نەبێت تەسلیم ببێت بە الله بە ئەنجامدانی یەکێك لەوانەی باسکرا

ئەوە ئیمانی نەهێناوە و كافرە با بە إعتقاد و بە قەولیش إقرار بە ئەمر یان حوكمی الله بكات، بۆ سەلماندنی ئەم قسانەشمان لەگەڵمان بن لەم كتێبەدا بە ئیزنی الله زۆر بە وردی و بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر ئەو قسانەمان دەسەلمێنین.

لەسەر ئیمان ئیمامی **شافیعی**(ت ٢٠٤) دەڵێت: "كان الإجماع من الصحابة والتابعين ومن بعدهم ممن أدركناهم يقولون: الإيمان قول وعمل ونية، لا يجزئ واحد من الثلاثة إلا بالآخر".

واتە: كۆدەنگی لە هاوەڵانەوە و تابیعیەكانەوە و پاش ئەوانیش هەبووە ئەوەندەی كە پێمان گەشتوە دەڵێن: **ئیمان بریتیە لە قەول و عەمەل و نیەت**(إعتقادی دڵ)، **<u>هیچ كام لەوانە نایەنە دی ئیللا لەگەڵ ئەوی دیكەیان نەبێت</u>**.

((شرح أصول اعتقاد أهل السنة)) للالكائي (5/ 957)، ((مجموع الفتاوى)) لابن تيمية (209/7)

منیش دەڵێم: با ئەم قەولەی ئیمامی شافعی لەیەك بدەین بە حاكمێكی یاسادانەر پێچەوانەی شەرعی الله، بزانین ئایا جەحد نەكردنی هیچ سودێكی پێ دەگەیێنێت؟ ئەگەر سەیری بكەین دەبینین ئیمامی شافیعی ئیجماع نقڵ دەكات بەوەی كە هیچ كام لەو سیانە بەبێ یەكتری نایانكرێت واتە إعتقاد و قەولی بێ عەمەلیش بە هیچ شێوەیەك نایكرێت و ئیمانەكە دروست نیە و نەهێنراوە، جا ئەگەر سەیرێكی حاڵی یاسادانەر بكەین كە یاسای دارِشتووە دەبینین كە ئەگەر إقراریش بە حوكمی الله بكات بەڵام مادەم بە عەمەل بەو یاسایەی كە دایناوە نوسیویەتی ژن و پیاو یەك بەش دەبەن، كەواتە ئەمری اللەی پشتگوێ خست عەمەلی بەم ئەمرە نەهێشت و تەسلیم بەم ئەمرە نەبوو، كەواتە سەد ساڵ بە إعتقاد خۆی بە تاوانبار بزانێت و بە زمانی

خۆی بە تاوانبار بزانێت هەر كافرە چونكە عەمەلی پێ نەكردوون و بە یاسا عەمەل بە ئەمری الله ــ پەككستووە.

الآجري(ت ٣٦٠) دەڵێت: "إن الإيمان معرفة بالقلب تصديقا يقينا، وقول باللسان، وعمل بالجوارح، ولا يكون مؤمنا إلا بهذه الثلاثة، لا يجزئ بعضها عن بعض".

واتە: ئیمان ناسینە بە دڵ و بەڕاست دانانێك بە یەقینەوە، وە گوتنە بە زمان، **وە عەمەلی جوارحە، وە كەس ئیماندار نابێت ئیللا بەم سیانە نەبێت، هەندێكیان لە هەندێكی دیكەیان جیانابێتەوە.**

((الشريعة)) (686/2)

دەڵێم: لای ئەهلی عیلم ئەگەر كەسێك عەمەلی نەبێت بە ئەمرەكانی الله چ ئەوانەی كە شرطی صحەن(وەكو كفر بە طاغوت كە بە تەرككردنی مرۆڤ ئیمانی نیە)، چ ئەوانەی شرطی كمالن(وەكو دووركەوتنەوە لە زینا، كە بە سەرپێچی لەمەدا لە ئیمان كەم دەكاتەوە، بەلام بە تعطيل كردنی ئەو عەمەلە ئیمان نامێنێت) ئەوە ئیمانی نیە و كافرە، بەڵام لای داستانیەكان و مەدخەلیەكان ئەگەر حاكم یاسا دانێت و ئەمرەكانی الله لە عەمەل پێكردن پەك بخات مادام إقراری بە قەلب و قەول هەیە موسوڵمانە بەلایانەوە، لە كاتێكدا لای ئەهلی عیلم كافرن.

إبن بطة(ت ٣٨٧) لەسەر ئیمان دەڵێت: "وأنه تصديق بالقلب، وإقرار باللسان، وعمل بالجوارح والحركات، لا يكون العبد مؤمنا إلا بهذه الثلاث".

واتە: ئەوە باوەڕپێبوونە بە دڵ و إقرار كردنە بە زمان و عەمەلە بە ئەندامەكان، **وە بەندەش ئیماندار نابێت ئیلا بەو سێ دانەیە نەبێت.**

((الإبانة الكبرى)) (760/2).

دەڵێم: ئەو إبن بطەیەی كە داستانیەكان فەخر و شانازی پێوە دەكەن و خۆیان دەدەنە پاڵی و زۆر وەسفی دەكەن، عەمەلی جەوارحی لە ئیمان

دانەبڕیوە و گوتیەتی بەندە ئیماندار نابێت بێ ئەو سێ دانەیە، کەواتە حاکمێك کە یاسا دادەنێت و عەمەلەکان کە الله ئەمری پێکردوون تعطیل دەکات لای إبن بطة کافرە، لای داستانیەکان موسوڵمانە، ئەمە جیا لەو حاکمەی کە حوکمی الله ـی چەسپاندوە بەڵام جار جار سەرپێچی دەکات ئەم سەرپێچیەی وەکو پێشتر باسمان کرد لە ئیمان کەمدەکاتەوە، بەڵام نەهێشتنی عەمەلی جەوارح و دابڕینی لە ئیمان لەلایەن کەسێکەوە لای هیچ کەس ئیماندار نییە ئیلا لای جەهمی و مورجیئەکان نەبێت.

دووبارە *الآجري*(ت ٣٦٠) لە وەسفی ئەو کەسانەی کە ئامادە نین عەمەل بکەن دەڵێت: "فمن لم يصدق الإيمان بعمله وبجوارحه؛ مثل: الطهارة، والصلاة، والزكاة، والصيام، والحج، والجهاد، وأشباه لهذه، ورضي من نفسه بالمعرفة والقول، لم يكن مؤمنا، ولم ينفعه المعرفة والقول، وكان تركه للعمل تكذيبا منه لإيمانه، وكان العمل بما ذكرنا تصديقا منه لإيمانه".

واتە: **ئەوەی تصدیقی ئیمانەکەی نەکات بە عەمەل و بە جەستەی**، وەکو پاکوخاوێنی(کە شرطی صحەی نوێژە)، نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و جیهاد ئەوانەی وەکو ئەمانە وان، **کە وای زانی تەنها زانین**(بە قەلب) **گوتن بە زمان بەسە بۆی ، ئەوە ئیماندار نییە، وە زانین بە دڵ و گوتن بە زمان هیچ سودی پێ ناگەیێنێت، وە تەرككردنی عەمەل**(بە تەواوی) **بەوەی کە باسمان کرد بریتیە لە بەدرۆخستنەوەی ئیمانەکەی، وە عەمەل بەوەی کە باسمان کرد تصدیق و بەڕاستدانانە بۆ ئیمانەکەی**.

((الشريعة)) (2/ 611-614)

دەڵێم: سەیری قەولەکەی الآجري بکەن زۆر بە ڕوونی پێمان دەڵێت إعتقادی قەلبی و گوتن بە زمان بە تەنها بەبێ عەمەل هیچ ئیمانێك نایێنێتە جێ، وە ئەگەر سەیری ئەو نمونانەشی کە هێنایەوە بکەین تەنها دانەیەکیان بە

تەواوی و بە إجماع خودی نەکردنەکە کوفرە کە ئەویش تەرکی نوێژەکەیە، جا ئەگەر سەیری باقی نموونەکانی دیکەی بکەین وەکو پاکووخاوێنی و زەکات و حەج و ڕۆژوو لای زۆرینەی زانایان تەرکی ئەمانە کوفر نین بگرە بە حەدیسی صحیحیش دواتر دەیسەلمێنین کە تەرکی زەکات کوفر نیە یان لانی کەم اختلاف هەیە لەسەر ئەمانە کە ئایا تەرك کردنیان کوفر بن یان نا، بەڵام بۆ دڵنیا بونەوەمان بە تەواوی ئەگەر سەرنج بدەین باسی جیهادیشی کردووە کە بە دڵنیاییەوە بێ جیاوازی ڕای هەموو زانایان لەسەر ئەوەیە کە تەرکی جیهادکردن لە پێناوی الله لە تاوانە گەورەکانە بەڵام کوفر نیە، جا بۆچی ئێمە لێرەدا زۆر دڵنیا دەکەینەوە لەسەر پەیداکردنی نمونەهاییێك لە قەولەکەیدا کە کوفر نەبن؟ چونکە دەمانەوێت بیسەلمێنین کە تەنانەت ئەو عەمەلانەشی کە شرطی کمالی ئیمانن نەوەك شرطی صحە یان ئەسڵی ئیمان بن، خۆ مەنع کردن لە عەمەل پێ کردنیان، واتە وازهێنان لە گوێڕایەڵی الله بە تەواوەتی لە جێبەجێ کردنی ئەم عەمەلانەدا کوفرە بە الله و نەمانی ئیمانە سەرەڕای إقرار بە زمان و معریفەی قەلبی إعتقاد، وە دەمانەوێت بیسەلمێنین کە حاکم کە بە نوسراو یاسا دادەڕێژێت و خۆیی و خەڵکی لە جێبەجێ کردنی ئەمرەکانی الله بە عەمەل مەنع دەکات کافرە سەرەڕای خۆ بە تاوانبار زانینی بە إعتقاد و بە قەول.

جا ئەگەر سەرنجی کۆتایی قەولەکەی الآجري بدەین زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی دەڵێت کە عەمەل کردن بە ئەمر و نەهیەکانی الله ـوە تصدیقە بۆ ئیمان، وە خۆ مەنع کردن لە عەمەل کردن بەم ئەمر و نەهیانەی الله ـوە تکذیبی ئیمانە، کەواتە عەمەل کردن بە ئەمر و نەهیەکانی الله لەلایەن حاکمەوە بە چەسپاندنیان لە دەستوور بریتیە لە تصدیقی ئیمان، بەڵام لابردنی ئەم ئەمر و نەهیانە و دانانی ئەمر و نەهیەکی نوێی دەستکرد لە دەستووردا

بریتیە لە مەنع كردنی خۆیی و خەڵك لە عەمەل كردن بەم ئەمر و نەهیانەی الله ـوە كە ئەمەش تكذیبی ئیمانە سەرەڕای بە ڕاست دانانی ئەم حوكمە بە إعتقاد و بە قەول، جا الله تعالی ڕووی هەر جەهمیەك ڕەش بكات كە بیەوێت بە خیانەت كردن لە سەلەف و زانایان ئەثەری إبن عباس بەكاربهێنێت بۆ عوذر دان بەو حاكمەی كە یاسا پێچەوانەی شەرعی الله دادەڕێژێت و خۆیی و خەڵكی مەنع دەكات لە تطبیق كردنی ئەم عەمەلانە، الله ڕوویان ڕەش بكات، ئەگەر شایەنی هیدایەت نین الله لە كۆڵی ئەم ئومەتەیان بكاتەوە، چونكە بەهێزترین ژەهریان ڕشتووە و چەندین كەسیان گومڕا كردوە.

تێبینی:- لە قەولەكەیدا كە باسی جیهاد دەكات و كە دەڵێت زانین بە دڵ و بە زمان بەبێ عەمەل تكذیبە بۆ ئیمانەكەی مەبەستی لەوەیە كە كەسێك نیەت بهێنێت كە ئەگەر هەزار جاریش لە ژیانیدا بۆی بڕەخسێت كە جیهاد بكات و جیهاد لەسەری فەڕزی عەین بێت و بڵێت: "هەرگیز نایكەم و إطاعەی الله ناكەم" یان نیەتی لێ بهێنێت كە بە عەمەل هەرگیز نەیكات ئەو كاتە ئیمانەكەی بەدرۆ خستوەتەوە، ئەمە بۆ ئەو كەسانەیە كە لە زەمەنێكدا دەژین و دەرگای جیهاد والایە و جیهاد فەزی عەینە لەسەریان، ئەگەر بۆیان ڕەخسا و نەیكەن لەبەر دونیا و ترس یان شەهوەت ئەوە لە تاوانە گەورەكانە، بەڵام ئەو كەسەی یان بە نیەتی یان بە دەمی إعلانی دەكات كە تا مردن ئامادە نییە گوێڕایەڵی الله بكات لە جیهاد كردن ئەگەر دەیان جاریش بۆی بڕەخسێت ئەمە لێرەدا نەیویستوە عەمەل بەو ئەمرەی الله بكات و تكذیبی ئیمانەكەی كردووە با بە دەمیشی و بە إعتقادیشی جیهاد بە فەڕز بزانێت و خۆشی بە تاوانبار بزانێت، ئەگینا ئەگەر جیهادیش نەكات چەندەها جاریش بەڵام لە پابەندی الله دەرنەچێت ئەمە كافر ناكەین و تكفیری ئەمە لە كاری خەوارجە، جا بۆیە با كەس بە هەڵە لە ئێمە تێ نەگات بەوەی خەڵكی بە تاوانە گەورەكان تكفیر دەكەین، تكفیری ئێمە بۆ ئەو كەسانەیە كە نایانەوێت عەمەل بكەن لە ئەمرێك یان نەهیەك یان فەڕزێك یان زیاتر، ئەویش لە حاڵەتی تاكە كەسیدا لە زۆر كەم كەسدا بەدی دێت لە موسوڵمانان، چونكە موسوڵمان بەخۆی دەزانێت هاتنە ناو ئیسلام بریتیە لە معریفەی دڵ و إقرار بە زمان و عەمەلی جەوارح، بۆیە سەرەڕای ئەنجامدانی چەندەها تاوان، ئینسانی موسوڵمان قەت نیەتی ئەوەی نییە كە لە پابەندی اللەوە دەرچێت سەرەڕای ئەوەی ئیمانەكەی لاواز ببێت بە ئەنجام دانی كبائرەكان، بەڵام ئەو كەسانەی كە نایانەوێت عەمەل بكەن كە گوتمان لە حاڵەتی تاكە كەسیدا زۆر كەم بەدیدەهات، لە حاڵەتی یاسادانەردا زۆر زۆر بە ئاسانی بەدیدێت بەوەی چونكە یاسادانەر پێویستی بە بەرنامەیە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، خۆ نابێت هەر ڕۆژە و بە ئارەزوی خۆی و لە گیرفانی خۆیەوە حوكم و بڕیارێك بدات، كەواتە پێویستە بەرنامەی كارێك دیاری بكات بۆ حوكم كردن و بەڕێوەبردنی وڵات و جێبەجێ كردنی بەسەر تاك بە تاكی كۆمەڵگەدا بێ جیاوازی، كە یان ئەوەتا دانە بە دانەی ئەو یاسایانە لە ئیسلامەوە وەردەگیرێن، یانیش ئەوەتا بە هەواو هەوەسی خۆی دایان دەنێت كە ئەمەش بێ شك تەركی جنسی عەمەلە، كە گوتمان تەركی جنسی عەمەلیش تكذیبی ئیمانە، بۆ نمونە ئەگەر بە یاسا جیهاد لە پێناو اللەدا پەك بخات و بگوترێت: "سەرەڕای ئەوەی بۆشمان بڕەخسێت و بشبێتە

فەرز لەسەرمان بەڵام ئێمە جیهاد پەك دەخەین و بەهیچ شێوەیەك نایكەین! ئەمە تكذیبی ئیمانەكەیەتی وەلەو بە إعتقادیش و بە قەولیش إقراری بە حەقی و فەرزی جیهاد بكردایە، كەواتە قەولەكەی الآجری لەسەر ئەمەیە".

إبن بطة(ت ٣٨٧) دەڵێت: "ولا يكون العبد مؤمنا إلا بأن يجمعها كلها، حتى يكون مؤمنا بقلبه، مقرا بلسانه، عاملا مجتهدا بجوارحه، ثم لا يكون أيضا مع ذلك مؤمنا حتى يكون موافقا للسنة في كل ما يقوله ويعمله، متبعا للكتاب والعلم في جميع أقواله وأعماله، وبكل ما شرحته لكم نزل به القرآن، ومضت به السنة، وأجمع عليه علماء الأمة".

واتە: وە بەندە نابێت بە ئیماندار هەتاوەكو هەموویان كۆنەكاتەوە، **هەتاوەكو بە دڵی ئیماندار دەبێت، بە زمانی دانپێدانان بكات، بكەر بێت و هەوڵدەر بێت بە ئەندامەكانی لاشەی، وە لەگەل ئەمەشدا ئیماندار نابێت هەتاوەكو موافیقی سونەت نەبێت بەوەی كە هەموو ئەوەی كە دەیڵێت ئەنجامی بدات، شوێنكەوتەی قورئان و زانست بێت و لە هەموو گوتراوێكی و كردارێكیدا**، وە بە هەموو ئەوەی كە بۆم باسكردن قورئان دابەزیوە، وە سونەتی لەسەر ڕۆشتووە، وە زانایانی ئومەتی لەسەر كۆدەنگ بوون.

((الإبانة الكبرى)) (760/2)

بە ئیزنی الله تعالى دەڵێم: زۆر دڵنیام ئەوەی بە شوێن حەقدا بگەڕێت و حەقدۆست و حەقویست بێت تا ئێرای بەسە بۆ ئەوەی چاوی بكاتەوە و بزانێت كە جەهمیەكانی سەردەم چ ژەهرێكیان ڕشتووە كە زانایان بەم جۆرە ڕەدیان دەدەنەوە، داستانیە كەرامیەكان دەڵێن ئەگەر حاكم هات و یاسای دارشت پێچەوانەی شەرعی الله تعالى و هەتاوەكو دەمرێت حوكم نەكات بە شەرعی الله تعالى و عەمەلی پێ نەكات ئیماندارە مادام بە إعتقاد و قەول جحدی نەكردووە و إقراری پێی كردووە، تەنها ئەوەندەیان پێ دەڵێم كە چاوێك بكەنەوە بزانن لە چ گێژاوێكدا گیرتان خواردووە، كیبر نەتگرێ كە حەقت بینی وەری گرە، مەڵێ من ئەو هەموو كتێبەی سەلەفم

خوێندوەتەوە چۆن دەبێ دان بەهەڵەی خۆمدا بنێم، لە الله بترسە و حەق وەرگرە، خۆ ئەگەر دەڵێیت "حەقەکە لای منە" ئەوە وەرە ئەگەر حەقدۆستیت وەرە ڕاستم کەرەوە، ئەگەریش تێگەشتوویت کە لە چ هەڵەیکدا ژیاویت، ئەوە هیچ کیبرت نەبێت تەوبە بکە لێی! تەوبە بکە! چونکە بە ڕاستی ئەوەی تۆ دەیڵێی ئەوپەڕی إرجائە.

سەیرێکی ئەم قەولەی إبن بطة بکەن، دەڵێت لەگەڵ ئەمەدا ئیماندار نابێت واتا کافرە هەتاوەکو ئەوەی کە دەیڵێت بە عەمەل جێبەجێی نەکات، کەواتە بەمەدا بزانە ئەو حاکمانەی کە یاسا دادەڕێژن پێچەوانەی شەرعی الله، عەمەل کردن بە شەرعی الله پەك دەخەن ئەگەر إعتقادیان وابێت کە تاوانبارن و شەرعی الله حەقترە ئەوە هێشتا هەر کافرن و ئیماندار نین تاوەکو ئەوەی باوەڕیان پێیەتی بە عەمەل نەیچەسپێنن، وە هەتاوەکو بە عەمەل ئەوەی إعتقادیان پێیەتی پەکخستبێت ئەوە ئیمانەکەیان دروست نییە و کافرن.

إبن تيمية دەڵێت: "إن حقيقة الدين هو الطاعة والانقياد، وذلك إنما يتم بالفعل، لا بالقول فقط، فمن لم يفعل لله شيئا فما دان لله دينا، ومن لا دين له فهو كافر".

واتە: ڕاستی دین بریتیە لە **گوێڕایەڵی و پابەند بوون، وە ئەوەش هەر بە کردەوە دەبێت، نەوەك تەنها بە قەول، وە ئەوەشی کە فعلێکی بۆ الله نەکردبێت ئەوە دینەکەی بۆ الله نەبوە، وە ئەوەشی دینی نەبێت کافرە.**

((شرح العمدة)) (86/2)

دەڵێم: ئەو إبن تیمیەیەی کە یەکێك لە دەمڕاستەکانتان بە جەهمی و کافر ناوی دەبات، کە ئێوەن جەهمی نەك إبن تیمیة کە عەمەلتان لە ئیمان دابڕیوە بە تەواوەتی لە بابەتی یاسادانان و تحاکمدا، ئەو إبن تیمیەیە دەڵێت

دین دوو شتە، گوێڕایەڵی و پابەند بوون، وە بۆشمان دەسەلمێنێت کە قەول و گوفتاری بێ کردەوە بێ دینییە وە بێ دینیش کافر بوونە بە اللە، سەدبارەی دەکەمەوە، هەی ئەو کەسەی کە عەمەلت لە ئیمان دەرکردووە! کامەیە پابەندی یاساداڕێژەر پێچەوانەی شەرع بە دینەوە؟ کامەیە عەمەلی یاسادانەر بەو قەولەی کە إقراری پێ دەکات؟(کە ئەگەر بیشیکات کە تەحەدا دەکەم لە هەموو مێژوودا یەك یاسادانەرمان نەبووە ئیللا یاساکەی خۆی لە هی اللە بە باشتر داناوە)، بە اللە قەسەم هەرکەسێك بزانێت و عیلمی هەبێت بەوەی کە تێیکەوتوە، بڵێت یاسادانەر کە یاسای دژی شەرع داڕشتووە تەنها بە فعلی یاسادانان کافر نابێتەوە، ئەوە عەمەلی لە ئیمان دەرکردووە، وە ئەوەشی عەمەل لە ئیمان دەربکات و لێی داببڕێت، چ لە بابێکی ئیماندا بێت یان زۆر، ئەوە کوفری کردووە بە اللە تعالى چونکە کوفر کردن بە بەشێك لە دین کوفرکردنە بە هەموو دین، جا ئەم کوفرەشیان لە هەموو بابەکانی تەوحیدە چ لە ربوبیەت چ لە الوهیەت چ لە اسماء الصفات.

سوفیانی کوڕی عیینە(ت١٩٨) دەڵێت: "فركوب المحارم مثل ذنب آدم عليه السلام وغيره من الأنبياء، وأما ترك الفرائض جحودا فهو كفر مثل كفر إبليس لعنه الله، وتركها على معرفة من غير جحود، فهو كفر، مثل كفر علماء اليهود. والله أعلم".

واتە: ئەنجامدانی حەرامکراوەکان وەکو تاوانەکەی ئادەمە علیە سلام وە بێجگە ئەویش لە پێغەمبەران علیهم السلام ، بەڵام تەرککردنی فەرزەکان بە جەحدەوە کوفرە وەکو کوفرەکەی ئیبلیس نەفرەتی اللەی لێبێت، **بەڵام تەرککردنی سەرەڕای ئەوەی کە بشزانێت و جحودیشی نەکات، ئەوەش کوفرە، وەکو کوفری زاناکانی یەهود، واللە اعلم.**

((السنة)) لعبد الله بن أحمد (٣٤٧/١)

بە ئیزنی الله تعالی دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی کە قەولەکەی سوفیان رحمە الله زۆر وازح و ئاشکرایە و مفهومەکەشی زۆر جوان ڕوونە مەبەستی لە چییە، بەڵام إبن القیم لە (٣٤٦/١) دەڵێت کە شەیتان جەحدی ئەمری الله ـی نەکرد بەڵام ئامادە نەبوو ملکەچی الله ببێت بە کیبرەوە، وە لێرەشدا سوفیانی کوڕی عیینە دەڵێت کە شەیتان جەحدی ئەمری الله ـی کرد، وە تێبینیەکی دیکەش ئەوەیە کە ئێمە چەندین دەلیل و بەڵگەمان هەیە کە زاناکانی یەهوود و نەسارا جەحدی ئەمر و فرمانەکانی الله ـیان دەکرد و بەهۆی ئەمەشەوە کافر دەبوون، بەڵام لێرەدا سوفیان رحمە الله نمونەمان بۆ دەهێنێتەوە بە عولەماکانی یەهوود بەوەی کە جەحدی ئەمری الله ـیان نەکردووە بەڵام تەرکی جنسی عەمەلیان کردووە، جا ئەوەی زۆر گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێ بدەم ئەوەیە کە دیدی سوفیان و إبن القیم بۆ بابەتی شەیتان و دیدی زانایانی دیکە و سوفیان بۆ بابەتی زانایانی یەهوود لەوەچێ جیاواز دەربکەوێت، بەڵام جیاوازی ئەم دیدانە گرنگ نییە و شتێکی وا لە باسەکە ناگۆڕێت چونکە ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە فەهم و ناوەڕۆکی هەردوو دیدە جیاوازەکە یەك شتە بۆ جەحد و امتناع، هەردووکیان بەلای هەردوو جۆرە دیدەکەوە کوفری گەورەن، چونکە جەحد بریتیە لە ئینکاری کردن بە إعتقاد، وە امتناعیش بریتیە لە مەنع کردنی نەفس لە ئەنجام دانی بە عەمەل، کەواتە گرنگ نییە سوفیان یان هەر زانایەکی دیکە رحمهم الله، ڕایان لەسەر شەیتان یان یەهوود چۆن بووە کە ئایا جەحدیان کردووە یان امتناع، گرنگ ئەوەیە هەموو زانایان بێ جیاوازی کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەم جەحد هەم امتناع کوفرن، وە ئێمەش لەم کتێبەدا زیاتر تەئکید لەسەر سەلماندنی کوفر بوونی امتناع دەکەینەوە(قەول و إعتقادی بێ عەمەل)، هەر بۆیەشە ئەم قەولەی سوفیانی کوڕی عیینەمان

هێنایەوە کە بۆمان دەردەخات امتناع بەبێ جەحد کوفرە، ئیتر گرنگ نیە بۆمان ئایا شەیتان امتناعی کردووە یان زاناکانی یەهوود ئەوەیان لای اللەیە.

**الأوزاعي**(ت ١٥٧) دەڵێت: "فمن آمن بلسانه وعرف بقلبه وصدق بعمله فتلك العروة الوثقى التي لا انفصام لها، ومن قال بلسانه ولم يعرف بقلبه ولم يصدقه بعمله لم يقبل منه وكان في الآخرة من الخاسرين".

واتە: ئەوەی بە زمانی ئیمانی هێنا وە بە دڵی باوەڕی هێنا وە بە عەمەلەکەی تصدیقی کرد، ئا ئەوە ئەو پەتە قایمەیە کە پچڕانی بۆی نییە، بەڵام ئەوەی بە زمانی بیڵێت بەڵام بە دڵ نەیزانێت و بە عەمەل تصدیقی نەکات ئەوە لێی قەبوڵ ناکرێت وە لە ئاخیرەتیشدا لە خەسارەتمەندانە.

((الإبانة)) لإبن بطة (٨٠٧/٢)

بە ئیزنی اللە دەڵێم: الأوزاعي رحمه الله بە دوو بڕگە قسەکەی کرد، بڕگەی یەکەمی ئەوە بوو گوتی ئەوەی بە دڵ زانی و بە زمان دانیپێدا نا و بە عەمەل تطبیق کرد ئەوە دەستی گرتووە بە عروة الوثقى ـوە، کە ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر خەلەلی لە یەکێك لەو سیانە هەبوو ئەوە دەستی نەگرتووە بە عروة الوثقى ـوە، وە لە بڕگەی دووەمیدا پێی گوتین ئەگەر ئەوەی بە زمان گوتی و بەڵام بە دڵ نەیزانی و بە عەمەل تصدیقی نەکرد ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت، کەواتە ئەگەر سەرنج بدەن، لە بڕگەی دووەمدا ڕاستە زانینی دڵیشی کردە ناو بابەتەکەوە، بەڵام لە بڕگەی یەکەمدا بە قسەکەیدا دیارە کە هەرسێکی مەرجن بۆ دەستگرتن بە عروەی وثقاوە، کەواتە نەبوونی یەکێك لەو سییانە دەبێتە هۆی نەمانی ئیمان ئیتر ئەو نەبوونە چ لە

إعتقادەكە بێت چ لە عەمەلەكە بێت چ لە قەولەكە بێت بە تەنها كافیە بۆ كافر بوونەوە.

إبن بطة پاش هێنانەوەی ئەو ئایەتانەی كە دەلالەت لەوە دەكەن عەمەل لە ئیمانە دەڵێت: "فقد تلوت عليكم من كتاب الله عز وجل ما يدل العقلاء من المؤمنين أن الإيمان قول وعمل، وأن من صدق بالقول وترك العمل كان مكذبا وخارجا من الإيمان وأن الله لا يقبل قولا إلا بعمل ولا عملا إلا بقول".

واتە: چەند ئایەتێكم لە كتابی الله عزوجل بۆ هێنانەوە كە دەلیلە بۆ خاوەن ئەقڵەكان لە ئیمانداران كە ئیمان قەول و عەمەلە، **وە بەڕاستی ئەوەی بە زمان باوەڕی پێی هەبوو بە عەمەل تەركی كرد ئەوە درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە**، وە بەڕاستی الله قەولێك بەبێ عەمەل قبول ناكات وە عەمەلێك بەبێ قەول قبوڵ ناكات. الإبانە (٢/٧٩٥)

بە ئیزنی الله دەڵێم: عەمەل وەكو سەرەتاش باسمان كرد دوو جۆرە یان ئەوەتا مەرجی هێنانی ئیمانە یانیش ئەوەتا تەواوكەری ئیمانە، جا كە زانایان گوتیانە ئیمان بەبێ عەمەل بەجێ نەهاتوە مەبەستیان لە هەردوو جۆرە عەمەلەكەیە نەك تەنها دانەیەكیان، بۆ نمونە ئەگەر یەكێك تەنها یەكجار جنێوێك بداتە الله، بەڵام بە دڵ إقرار بكات بەوەی جنێو دان بە الله كوفرە، ئەوە هەر كافر دەبێتەوە بەم جنێودانەی، وە لە جۆری دووەمی عەمەلیش، ئەگەر یەكێك بڵێت سەرەڕای ئەوەی دەزانم كە مەشروب حەرامە بەڵام ئامادەنیم ملكەچی الله بكەم لە تەركی مەشرووبخواردنەوە، ئەمەش كافرە ئەگەر لەگەڵ ئەم تەركی عەمەلەشیدا بە دڵ و بە زمان إقرار بە حەرامی مەشرووب بكات، چونكە تەركی جنسی عەمەلێكی كردووە كە

ئەویش دووركەوتنەوە لە خواردنی مەشرووبە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەندین جاریش بیخواتەوە بە خودی خواردنەوەکە پێی کافر نابێتەوە، کەواتە تەرکی جنسی عەمەل ئیتر چ بە نیەتی دڵ بێت نەتەوێت إطاعەی الله بکەیت یان بە نیشانەیەك دەریبخەیت کە تۆ ناتەوێت إطاعەی الله بکەیت سەرەڕای ئەوەی إقراریشی پێ بکەیت ئەوە تۆ هەر کافریت چونکە وەکو إبن بطه لە سەریێ گوتی: "ئەوەی بە بە زمان باوەڕی پێی هەبوو بە عەمەل تەرکی کرد ئەوە درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە"، بۆ نمونە حاکم بە یاسا دەڵێت: سووخواردن لە وڵاتی ئێمەدا ئازادە سەرەڕای ئەوەی دەشزانین کە سووخواردن حەرامە، جا ئێمە لێرەدا لەم یاسایەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەو دەقەوە کە ئەم یاسایە دەردەچێت سووخواردن و ڕیبا دەبێتە شتێکی ئاسایی و کەس بۆی نیە لە خەڵکی مەنع بکات و لەو دەقەوە کە ئەو یاسا دەرچووە تا هەمیشەیی ڕیبا خواردن لە خۆیان و لە خەڵکی مەنع ناکەن، وە گریمان ئەگەر بە إعتقادیش و بە زمانیش دانیان بە حەرامی ڕیبا خواردندا نا، مادەم بە عەمەل ئامادە نەبوون ملکەچی ئەو عەمەلە ببن کە الله نەهی لێکردووە و تەرکی ئەو جنسە عەمەلەیان کرد(بە حەرامکردنی ڕیبا لەسەر خۆیان) ئەوە بە قەولەکەی إبن بطة درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە، وەکو هەمان ئەوەی کە گوتمان ئەگەر دان بە حەرامی مەشروبدا بنێت بەڵام ئامادە نەبێت لەسەر نەفسی خۆیی مەنع بکات و بە هەمیشەیی وەکو پابەند نەبونێك بۆ ئەمری الله مەشرووب بخواتەوە و تەرکی جنسی عەمەل بکات سەرەڕای ئەوەی بە دڵ و بە زمان إقرار بە حەرامی مەشرووبخواردنەوەدا بکات هەر کافرە، بەڵگەشمان بۆ ئەمە:

لە **معقلی کوڕی عبیداللهی العبسی**ـەوە ، کەوا پیاوێك بە ناوی **سالم الافطس** بە ئیرجائەوە دەرکەوت ، وە **معقل** چووە مەدینە بۆ لای **نافع**(کوڕەزای ئیمامی عومەرە و لە ساڵی ١١٧ ووفات دەکات) باسی حاڵەتەکەی بۆ **نافع** دەکات و دەڵێت: " قلت : إنهم يقولون: نحن نقر بأن الصلاة فريضة ولا نصلي، وأن الخمر حرام ونحن نشربها، وأن نكاح الأمهات حرام ونحن نفعل، وقال: فنتر يده من يدي ثم قال: من فعل هذا فهو كافر ".

واتە: بە نافعم گوت: ئەوان(مورجیئەکان) دەڵێن: ئێمە دان بە واجببونی نوێژدا دەنێین بەڵام نایکەین، **وە دان بە حەرام بوونی ئارەقدا دەنێین بەڵام هەر دەیخۆینەوە، وە دان بە حەرامی نیکاحکردن لەگەڵ دایکانماندا دەنێین بەڵام هەر دەیکەین**، پاشان **نافع گوتی: هەرکەسێك ئەوە بکات ئەوە کافرە**.

((السنة)) لعبد الله بن أحمد : ٣٨٢/١ ؛ ((الإبانة)) لابن بطة : ٨٠٩/٢ ؛ ((شرح أصول الاعتقاد)) للالكائي : ٩٥٣/١

بە ئیزنی الله دەڵێم: لێرەدا نافع بۆچی تەکفیری بکەری ئەو کارە دەکات لە کاتێکدا ئارەق خواردنەوە وە نیکاحی دایکان کەبیرەن نەوەك کوفر؟

لە وەلامدا دەڵێم: هەرکەسێك ئامادە نەبوو إطاعەی ئەمرێکی الله تعالى بکات بەوەی کە ئەگەر ئەمر بێت خۆی مەنع کرد لە جێبەجێ کردنی ئەو ئەمرە، یان ئەگەر نەهی بێت خۆی مەنع نەکرد لەو نەهیە، وە بە عەمەل تعطیلی یەکێك لەم ئەمرانە یان ئەو نەهیانەی کرد با إقراری قەلب و قەولیشی هەبێت مادەم پابەند نەبووە بە الله ـوە و مادەم بە عەمەل تصدیقی دانپێدانانی دڵ و زمانی نەکرد ئەوە کافرە، وەکو إبن بطة گوتی درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە.

جا بە هەمان شێوە هەر حاكمێك بە یاسا بڵێت: نیكاحكردن لەگەڵ دایكاندا لە وڵاتی ئێمەدا دەكرێت، سەرەڕای ئەوەی دەزانین كە حەرامە(چ دایك بێت یان خوشك بێت یان پور بێت ئەوانەی كە بۆ خواستن حەرامن)، ئەمە ئەم حاكمە هەمان حوكمی قەولەكەی نافعی هەیە و كافرە سەرەڕای ئەوەی بە زمان و بە دڵ دان بە حەرامی نیكاحكردن لەگەل دایكاندا بنێت، چونكە ئەوەی بە قەلب و قەول باوەڕی پێی هەبووە ئامادە نەبووە بە عەمەل تطبیقی بكات و تعطیلی ئەمەی كردووە بە عەمەل وە وەكو إبن بطة دەڵێت: درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە، وە الله تعالى ـش ڕووی ئەو مونافیق و درۆزن و جەهمیە ڕەش بكات كە قەولەكەی إبن عباس و إجماعی زانایان دەهێننەوە كە فەرموویانە خودی حكم بغیر ما أنزل الله مناطی كوفر نییە، و ئەمە بەسەر یاسادانانداندا تطبیق دەكەن، الله تعالى ڕیسوایان بكات، وە كاكی خوێنەر هەر كەسێیك هەیت، چ موحد بیت یان غەیرە موحد، پاش بینینی ئەم دەلیل و بەڵگانەی كە لەم كتێبەدا باسیان دەكەین، ئەگەر وابزانیت یاسادانەر كوفرەكەی كوفری بچوكە مادەم بە زمان إقرار بە حوكمی الله دەكات و ئەمە لەگەڵ زوڵم و ستەم و حوكم نەكردنی جار جاری حاكم بە قورئان چ بەهۆی خزمایەتیەوە بێت یان چ بەهۆی ڕەشوەیەكەوە بێت، جیا نەكەیتەوە و إجماعی زانایان لەسەر بابەتی حكم بەسەر یاساداناندا تطبیق بكەیت، والله وبالله وتالله پێی كافر دەبیتەوە و لە دین دەردەچیت و بە ئەبەدی لە ئاگردا دەمێنیتەوە، جا وریای دینەكەی خۆت بە و چاوت بكەرەوە با لەدەستی نەدەیت.

مەبەست كاژاوی لە پۆستێكیدا لە ساڵی ٢٠١٩ زۆر بە جوانی چەند نموونەیەك لەسەر ئەم بابەتە دەهێنێتەوە و باسی ئەم بابەتە دەكات بەم جۆرە كە ئەمەش دەقی پۆستەكەیەتی كۆپیمان كردووە:

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە -گۆڕی پڕ نوور بێت- دەفەرموێت: "فمن لم ينقد لأمره فهو إما مكذب له أو ممتنع عن الإنقياد لربه، وكلاهما كفر صريح".

واتە: هەر كەسێك فەرمانداری فەرمانی خوا نەبێت ئەوە یان ئەوەتا ئیمانی پێی نیە **یان خۆی ڕێگر دەكات لە ملكەچ بوون بۆ پەروەردگاری** (ئیمانی پێیەتی بەڵام تەركی ملكەچبوون وكردەوە وواجبەكان دەكات)، هەردووكیان كوفرێكی ڕوون وئاشكران.

الصارم ص ٩٦٩.

كەواتە مەداری كوفر دوو شتە:-

١. التكذيب والجحود: باوەڕنەهێنان وئینكاریكردن كە ئەمە پەیوەستە بە دڵەوە.

٢. الإمتناع والإعراض والإباء: كردەوە نەكردن وپشتێكردن كە ئەمەش پەیوەستە بە عەمەل وكردەوەی لاشەوە.

وە ئیمام ابن القيم -بەڕەحمەت بێت- فەرموویەتی: "الكفر وإن اختلفت شعبه فيجمعه خصلتان: تكذيب الرسول في خبره، وعدم الإنقياد لأمره"

واتە: كوفر هەرچەندە پۆل وجۆرەكانی زۆرە بەڵام دوو سیفەت هەمووی كۆدەكاتەوە: ئیمان نەهێنان بە پێغەمبەرﷺ وبەڕاست دانەنانی، **وە ملكەچ نەبوون بۆ فەرمانەكانی**. أحكام أهل الذمة.

پاشان مەبەست کاژاوی دەڵێت: ئەمەیە بیروباوەڕی سەلەف وئەهلی سوننەت وجەماعەت، **بە پێچەوانەی فکری مورجیئەکانەوە کە کوفر لایان تەنها ئینکاریکردن وباوەڕنەهێنانە، وتەرکی عەمەل وئینقیاد وملکەچبوون بۆ فەرمانەکان وحوکمی شەرع بە کوفر نازانن**، بەڵکو ئەگەر کەسێك هەر ئەوەندە بڵێت: **موسوڵمانم ئیتر ئەگەر تەرکی هەموو واجب وفەرزەکانی ئیسلامیشی کردبێت، وحوکم وفەرمانی خواشی پشگوێخستبێت بە تەواوی، لە فکری مورجیئەکاندا هەر موسوڵمانە، بێ ئاگا لەوەی ئیسلامەتی وئیمان خۆ تەنها ئیمانی دڵ وقسەی زوبان کافی نیە بۆی بەڵکو عەمەلی جوارح وکردەوەکردن بە فەرمان وحوکمەکان ڕوکن وبەشێکی دانەبڕاوی ئیمانە وئیمان بە بێ عەمەل هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت ولەجێی نەبوونە.**

(قسەکانی مەبەست کاژاوی تەواو)، کە لە ئەکاونتی فەیسبووکی خۆیەوە وەرمان گرتووە، ئەمەش لینکی پۆستەکەی کە دەتوانن کۆپی بکەن و لە براوزەری ناو موبایل یان کۆمپیتەرەکەتان پەیستی بکەن و لێیدەن ڕاست دەچێتە سەر پۆستەکەی:

https://www.facebook.com/458194717532499/posts/2954247927927153/

جا منیش دەپرسم: کامەیە پابەند بوونی حاکم کە پێچەوانەی شەرعی الله یاسا دادەنێت؟ کە پابەندی یاساکانی الله نیە و گوێڕایەڵیان ناکات و پشتگوێیان دەخات و یاسای دیکە دەخاتە جێگایان و خەڵکیشی پێوە پابەند دەکات، ئایا ئەمە خۆ مەنع کردن نیە لە گوێڕایەڵی کردنی الله؟ هەمان ئەو کوفرە نیە إبن تیمیة و إبن القیم باسی دەکەن؟ ئایا جەحد نەکردن و ئینکاری نەکردن هیچ سودی پێ دەگەیێنێت؟ ئایا جەحد و ئینکاری هیچ پەیوەندیان ما بە کافر بوونی ئەو کەسەی کە خۆی مەنع دەکات لە تەسلیم بوون بە ئەمرەکانی الله ـوە؟ ئایا لە قسەکانی إبن تیمیة و إبن القیم ڕوونتر هەیە؟

بڕیاردان لەسەر ئەمە بە جێ دەهێڵم بۆ تۆی خوێنەر کە ئایا پشتی ئەهلی سونە و جەماعە دەگریت لەم بابەتەدا یان پشتی چەند مورجیئە و جەهمیەکی کافر دەگریت کە عەمەلیان لە ئیمان دەرکردووە لەم باسەدا، جا وریا بن برایان کە پێیان دەڵێین جەهمی و مورجیئە مەرج نیە بە تەواوی وەکو جەهمی و مورجیئەکان عەمەل لە ئیمان دەربکەن لە هەموو ڕوویەکەوە، تەنها لە یەك بابەتدا عەمەل لە ئیمان دەربکەن ئەوە ئێمە بە جەهمی و مورجیئە ناویان دەبەین، چونکە کوفر بەبەشێك لە کتێب کوفرە بە هەموو کتێبەکە خۆی، وە ئەمانیش لە ڕویەکەوە عەمەل لە ئیمان دەردەکەن کە بابەتی یاسادانان و تحاکمە و عەمەل لە ئیمان دادەبڕن لێرەدا، کەواتە تەنها ئەم لێ دابڕینە کافیە بۆ ئەوەی بە مورجیئە و جەهمی ناویان بەرین.

نصر بن إبراهيم بن نصر المقدسي(٣٧٧-٤٩٠) دەڵێت: "فجعل عزوجل من هذه الآية أن من شرط الإيمان وصحته الانقياد لحكم رسوله ودل على أن من خالفه، غير منقاد للحق وغير ثابت الاسلام".

واتە: الله عزوجل لەم **ئایەتەدا پابەند بوون بە حوکمی رسولەکەیەوە کرد بە مەرجێکی هێنانی ئیمان**(نەك تەواوکەری ئیمان) کە ئەمەش دەلالەت لەوە دەکات **هەرکەسێك پێچەوانەی ئەمە بکات**(پابەند نەبێت پێوەی)، **ئەوە پابەند نەبووە بە حەقەوە وە و لەسەر دینی ئیسلام نییە**.

الحجة على تارك المحجة (٣٩١/٢)

دەڵێم: لەم قەولەی نصر بن ابراهیم المقدیسیەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە پابەند بوون بە حوکمی رسولەوە صلى الله عليه وسلم مەرجی هێنانی ئیمانە، واتە پابەند بوون لە تەواوکەری ئیمان نییە تا بەوجۆرەی کە داستانیەکان و

مەدخەلیەكان دەڵێن: "ئەگەر حاكم پابەندی حوكمی رسول نەبێت لە ئیمانەكەی كەم دەكات و نەوەك نەمێنێت" وە دەڵێن: "ئەم پابەند نەبوونە مەرجی هێنانی ئیمان نییە، و لە تەواوكەری ئیمانە، واتە ئەگەر یەكێك پابەند نەبێت بو حكمی رسولەوە كافر نییە و تەنها تاوانبارە مادەم بە زمانی و بە دڵی جەحدی حوكمی رسولی نەكردووە". منیش پێیان دەڵێم: لەم قەولەوە بۆمان دەركەوت كە ئەو حاكمانەی كە بە یاسا دژی شەرعی رسول یاسا دادەڕێژن و شەرعەكەی رسول پەك دەخەن و لە ئیشی دەخەن و عەمەلی پێوە ناكەن بەم كارانەیان پابەندی حوكمی رسول نەبون، بەم پابەند نەبوونەیان بە حوكمی رسولەوە كافر دەبن، وە تەنها بە عەمەل پابەند نەبوون بە حوكمی رسولەوە بەسە بۆ كافر بوونەوە، چونكە پابەند بوون و إنقیاد بە عەمەل دەكرێت، واتە ئەگەر بە إعتقاد و بە قەول خۆیی بە تاوانبار زانی هەر كافرە مادەم بە عەمەل پابەندی حوكمی رسول نەبووە، كەواتە وەكو نصر بن ابراهیم المقدیسی دەڵێت: هەركەسێك پێچەوانەی ئەمە بكات(پابەند نەبێت بە حوكمی رسولەوە)، ئەوە پابەند نەبووە بە حەقەوە و لەسەر دینی ئیسلام نییە، كەسێكیش لەسەر دینی ئیسلام نەبێت بەڕای ئێوە موسوڵمانە؟ لای مورجیئە و جەهمیەكان بەڵێ موسوڵمانە.

هیوادارم كەمێك ژیری و ئەقڵتان بكەنەوە و خۆتان نەدەنە دەست گەمژەیەك بە بەهانەی سەلەفەوە بتانخەڵەتێنێت و دڵنیاییەكی خەیاڵیتان بۆ دروست بكات بەوەی یاسادانان و پابەند نەبوون بە حوكمی رسولەوە كفر دون كفرە، هیوادارم بە بینینی ئەم دەلیلانە كەمێك حەقدۆست بن و بگەڕێنەوە بۆ دینەكەتان، بە مورتەدێكی دەجالی فێڵبازی زمان سیحراوی نەخەڵەتێن.

پاشان إبن تیمیة دەڵێت: "وتارة يعلم أن الله حرمها، ويعلم أن الرسول إنما حرم ما حرمه الله، ثم يمتنع عن التزام هذا التحريم، ويعاند المحرم، فهذا أشد كفرا من قبله، وقد يكون هذا مع علمه أن من لم يلتزم هذا التحريم عاقبه الله وعذبه".

واتە: وە هەندێكجار دەزانێت كە الله حەرامی كردووە، وە دەشزانێت كە رسول ئەوەی حەرام كردووە كە الله حەرامی كردووە، **پاشان مەنعی خۆی دەكات لە ئیلتیزام كردن بەم حەرامكراوەوە**، وە(بەمەش) عینادی ئەو حەرامكراوە دەكات(بەوەی كە ئامادە نیە بە عەمەل تطبیقی بكات)، **ئەمە كوفرەكەی توندترە لەوەی پێش خۆی**(پێشتر باسی جەحد دەكات، یانی ئەم كوفرە لە كوفری جەحد توندتر و گەورەترە)، وە ئەمەش لەگەڵ ئەوەدایە كە دەزانێت ئەگەر ئیلتیزامی ئەم حەرامكراوە نەبێت ئەوە الله سزای دەدات.

((صارم المسلول)) لإبن تيمية (٥٢١-٥٢٢)

بە ئیزنی الله دەڵێم: إبن تیمیة پێمان دەڵێت ئەو كەسەی كە خۆی مەنع دەكات لە خۆ ئیلتیزام كردن بە حەرامكراوەكانی الله ـوە سەرەڕای ئەوەی كە دەزانێت الله حەرامی كردووە، وە وەكو دیارە تەنها خۆ مەنع كردن لە پابەند بوون بەبێ مەرجی جەحد و ئینكار، بە كوفر دەزانێت، نەك بە كوفر، بە كوفرێكی توندتر لە كوفرەكەی پێش خۆی دەزانێت كە كوفری جەحد و ئینكارە، جا ئەی ئەو كەسەی كە الله تعالی كەمێك ئەقڵی پێ بەخشیویت، تەنها دەمەوێت من تێبگەیێنیت كە كوا لە كوێدایە پابەند بوونی یاسادانەر بە حەرامكراوەكانەوە، لە كاتێكدا بە یاسا ڕێگە بە حەرامكراوەكان دەدات لە وڵاتی خۆیدا و پابەندی بە الله ـوە لە وڵاتدا دووردەخاتەوە و ئەوەشی ئەم یاسایە بشكێنێت بە زەبری هێز ڕووبەڕووی دەبێتەوە، جا برام با گەمژەكان

نەتخەڵەتێنن بڵێن: "حەدەكان هیچ فەرقیان نییە لەگەڵ كبائرەكان، مەشروب خواردنەوە كوا كوفرە؟ كەواتە تعطیلی حەدەكانیش كوفر نییە مادام خۆیی بە تاوانبار زانیوە". ئەمە قسەی گەمژەكانە كە دەیانەوێت بەو جۆرە چەواشەی بابەتەكە بكەن و لە خەڵكی تێكبدەن، جا من لێرەدا بە ئێوە دەڵێم نەك بەو گەمژانە، چونكە ئەوان قوفڵیان لە مێشكی خۆیان داوە نایانەوێت تێبگەن، پێتان دەڵێم: حاكم كاتێك بە یاسا یەكێك لە ئەمرەكان یان حەرامكراوەكان یان فەرزەكان پەك دەخات كە الله داوای كردووە پابەند بین پێیانەوە بە عەمەل، ئەوە سەرەڕای ئەوەی ئەگەر بە إعتقادی باوەڕی پێی هەبێت بەڵام مادەم بە عەمەل تعطیلی ئەوانەی كردووە كافرە، طاغوتە، خوایەكە بێجگە لە الله ادعای خوایەتی دەكات، وە ئەوەشی بڵێت مادەم بە إعتقاد خۆی بە تاوانبار زانیوە كافر نییە، ئەویش كافرە وەكو ئەو، ئیتر چ بیڵێت یان بە یاسا بینوسێت، كە با خەڵكی بۆ خۆیان مەشروب بخۆنەوە، چ بە یاسا بیڵێت با خەڵكی بۆ خۆیان زینا بكەن، كافرە كافرە، لا ینفعه إعتقاده أو قوله!

وە هەر إبن تیمیة دەڵێت: "أجمع علماء المسلمین علی أن كل طائفة ممتنعة عن شریعه من شرائع الإسلام الظاهرة المتواترة فإنه یجب قتالها حتی یكون الدین كله لله".

واتە: زانایانی موسوڵمانان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەموو تائیفەیەكی خۆ مەنع كەر(لە عەمەلكردن بە) ** یاسایەك لە یاساكانی ئیسلام** لە ڕوكەشی و متواترەكان(بەبەڵگەی صحیحەوە لە رسول اللەـوە صلی الله علیه وسلم یان هاوەڵانەوە هاتبێت) **پێویستە كوشتاری بكرێت هەتاوەكو دین هەمووی بۆ الله دەبێت**.

مجموع الفتاوی (٢٨/٤٦٨)

بە ئیزنی الله تعالى دەڵێم: زۆر بە ڕوونی لەم قەولەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو یاسادانەرەی کە بە یاسا حوکمێك لە حوکمەکانی الله تعالى لا دەبات و یاسایەکی دیکەی دەستکردی خۆی دادەنێت لە باتی ئەوە، دەبێت کوشتار بکرێت تاوەکو هەموو دین بۆ الله تعالى بێت، وە گریمان بە إعتقاد و قەولیش إقراری بەو حوکمەی کرد کە گۆڕیویەتی، مادەم بە عەمەل پابەندی الله نەبووە تیایدا، وەکو إبن بطة گوتی: "كان مكذبا وخارجا من الإيمان". واتە: درۆزنە و لە دەرەوەی ئیمانە.

وە هەر إبن تيمية دەڵێت: "كل طائفة خرجت عن شريعة من شرائع الإسلام الظاهرة المتواترة فإنه يجب قتالها باتفاق أئمة المسلمين وإن تكلمت بالشهادتين فإذا أقروا بالشهادتين وامتنعوا عن الصلوات الخمس وجب قتالهم حتى يصلوا وإن امتنعوا عن الزكاة وجب قتالهم حتى يؤدوا الزكاة وكذلك إن امتنعوا عن صيام شهر رمضان أو حج البيت العتيق وكذلك أن امتنعوا عن تحريم الفواحش أو الزنى أو الميسر أو الخمر أو غير ذلك من محرمات الشريعة وكذلك إن امتنعوا عن الحكم في الدماء والأموال والأعراض والأبضاع ونحوها بحكم الكتاب والسنة وكذلك إن امتنعوا عن الأمر بالمعروف والنهى عن المنكر وجهاد الكفار إلى أن يسلموا ويؤدوا الجزية عن يد وهم صاغرون وكذلك إن أظهروا البدع المخالفة للكتاب والسنة وأتباع سلف الأمة وأئمتها مثل أن يظهروا الألحاد في أسماء الله وآياته أو التكذيب بأسماء الله وصفاته أو التكذيب بقدره وقضائه أو التكذيب بما كان عليه جماعة المسلمين على عهد الخلفاء الراشدين أو الطعن في السابقين الأولين من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان أو مقاتلة المسلمين حتى يدخلوا في طاعتهم التي توجب الخروج

عن شريعة الإسلام وأمثال هذه الأمور. قال الله تعالى: { وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله } فإذا كان بعض الدين لله وبعضه لغير الله وجب القتال حتى يكون الدين كله لله".

واتە: هەر تائیفەیەك چووە دەرەوە لە یاسایەك لە یاساكانی ئیسلام ئەوانەی ڕوكەش و متواترن، ئەوە پێویستە كوشتار بكرێت بە كۆدەنگی موسوڵمانان كە ئەگەر شایەتی دوو شەهادەكەیش بڵێت و دانیش بنێت بە دوو شەهادەتەكەدا، كە ئەگەر خۆی مەنع كرد لە پێنج نوێژەكە ئەوە پێویستە كوشتار بكرێن تاوەكو نوێژ دەكەن، **ئەگەر خۆیان مەنع كرد لە دانی زەكات ئەوە دەبێ كوشتار بكرێن تا زەكات دەدات، وە بەهەمان شێوە ئەگەر خۆی مەنع كرد لە ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان ئەوە دەبێ كوشتار بكرێت تاوەكو ڕۆژوو دەگرێت یان حەجكردنی بەیت، وە بە هەمان شێوە ئەگەر خۆی مەنع كرد لە حەرامكردنی فاحیشەكان و زینا و ئارەق و غەیری ئەوەش لە حەرامكراوەكانی شەریعەت، وە بە هەمان شێوە ئەگەر خۆیان مەنع كرد لە**(تطبيق كردنی بە عەمەل)**ی حوكمی خوێن و ماڵ و هەرشتێك لەو دەورە لە هەر حوكمێك لە كتاب و سونەت، وە بە هەمان شێوە ئەگەر خۆیان مەنع كرد لە ئەمر بە چاكە و نەهی لە خراپە و جیهادی كافران بۆ ئەوەی موسوڵمان ببن یان بە سەرشۆڕیەوە جزیە بدەن**، وە بەهەمان شێوە ئەگەر بیدعەیان دەرخست پێچەوانەی كتێب و سونەت و شوێنكەوتوانی سەلەفی ئومەت و زانایانی، وەكو دەرخستنی ئیلحاد لە ناوەكانی الله تعالى و سیفاتەكانی، یان بەدرۆ خستنەوەی ناو و سیفاتەكانی الله یان بە درۆ خستنەوەی قەزا و قەدەری وە بەدرۆ خستنەوەی ئەوەی كۆمەڵەی موسوڵمانان لەسەری بوون لەزەمەنی خەلیفە راشیدیەكاندا یان تانەدان لە

موهاجیرین و ئەنسارەکان وە ئەوانەشی کە شوێنیان کەوتوون بە چاکە، **یان کوشتاری موسوڵمانان بکەن تاوەکو دێنە ژێر گوێڕایەڵیان کە ببێتە هۆی چوونە دەرەوە لە شەریعەتی ئیسلامی وە چەند شتانێکی دیکەی وەکو ئەم شتانە**، ئەوە الله تعالى دەفەرمێت: (کوشتاریان بکەن تاوەکو شیرك نەمێنێت و دین هەمووی بۆ الله دەبێت) **کەواتە ئەگەر هەندێك لە دین بۆ الله بوو هەندێکی دیکەی بۆ غەیری الله، ئەوە کوشتار واجب دەبێت تاوەکو هەموو دین بۆ الله دەبێت**. مجموع الفتاوى (٢٨/٥١٠-٥١١)

بە ئیزنی الله تعالى دەڵێم: إبن تیمیه لەم قەولەیدا باسی خۆ مەنع کردن لە دوو جۆر شت دەکات وە باسی چەند خەلەلێکی إعتقادیش دەکات کە دەبنە هۆی کوفر، جا ئەگەر سەرنج بدەن باسی خۆ مەنع کردن لە نوێژ دەکات کە هەرکەس خۆی مەنع کرد لە پابەند بوون بە نوێژەوە ئەوە پێوسیتە کوشتار بکرێت تاوەکو نوێژ دەکات، وە لەگەڵ ئەمەشدا باسی خۆ مەنع کردن لەو عەمەلانەش دەکات کە وەکو نوێژ یان تکذیبی صفاتی الله نابنە کوفر، وەکو خۆ مەنع کردن لە دەستگرتنەوە لە حەرامکراوەکانی وەکو زینا و فاحیشە و ئارەقخواردنەوە لە کاتێکدا ئەمانە ئەنجامدانیان کوفر نین، بەڵام مەبەستی شیخ الإسلام لێرەدا ئەوەیە کە هەر کەس ئامادە نەبوو لە یەکێك لەم ئەمرانەدا ملکەچی الله ببێت بە عەمەل بە هیچ شێوازێك، ئەوە دەبێت کوشتاری بکرێت تاوەکو دێتە ژێر پابەندی ئەمری الله ـوە، بە خۆ مەنع کردن لەو حەرامکراوانە.

جا ئەم خۆ مەنع کردنانە (لە دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان) لە تاکە کەسدا زۆر بە کەمی دێتە جێ، واتە کەم کەسمان هەیە (لە ئەنجامدەری تاوانەکان) کە بەهۆی پابەند نەبوونیەوە بە الله ـوە ئەنجامدەری ئەو تاوانانە بێت بە هەمیشەیی،

بەڵام ئەم حاڵەتە بە ئاشكرا و بە وازح لەو یاسادانەرانەدا دەركەوتووە كە بە ئاشكرا حوكمەكان و ئەمر و نەهیەكان یان حەرام و حەڵاڵكراوەكانی الله تعالی پەك دەخەن و لە ئیشیان دەخەن و بە هەوەسی خۆیان شتی دیكە دەخەنە جێگەیان، وە ئەو حوكمەشی كە دەری دەكەن داوا لە سوڵتەی تنفیذی دەكەن جێبەجێی بكەن بەسەر تاك بە تاكی چین و توێژەكانی كۆمەڵگادا كە نابێت هیچ لایەنێك لە كۆمەڵگەدا ئەم یاسایانە بشكێنێت هەر كەسێك شكاندی ئەوە بە توندی سزای دەدەن، دەی ئەمەش شەڕكردن نییە لە پێناو ئەو یاسا دانراوانەدا كە دایناوە؟ قەولەكەی إبن تیمیە ڕێك دەلالەت لە حاڵی ئەو حاكمانە دەكات كە یاساكانی خۆیان بەزۆر دەسەپێنن بەسەر تاك بە تاكی كۆمەڵگادا بێ جیاوازی بە زەبری هێز ڕووبەڕوی هەركەسێك دەبنەوە كە ئەم یاسایانە دەشكێنێت كە إبن تیمیە لەسەر ئەمە دەڵێت: **یان كوشتاری موسوڵمانان بكەن تاوەكو دێنە ژێر گوێڕایەڵیان كە ببێتە هۆی چوونە دەرەوە لە شەریعەتی ئیسلامی وە چەند شتانێكی دیكەی وەكو ئەم شتانە**، قسەكانی تەواو

پاش هێنانەوەی ئەو نمونانە إبن تیمیە لە كۆتاییدا دەڵێت ئەمانە دەبێت كوشتار بكرێن تاوەكو دین هەمووی بۆ الله دەبێت، ئەمە كوشتارەش سەد لە سەد هۆكارەكەی كوفرە نەوەك شتی دیكە، چونكە دەڵێت كوشتاریان بكەن تاوەكو دین هەمووی بۆ الله دەبێت، واتە پێش ئەمە دین بۆ الله نەبوە چونكە ئەگەر دین بۆ الله تعالی بوایە ئەوە الله ئەمری نەدەكرد كوشتاریان بكەن تاوەكو دین بۆ الله تعالی بێت، وە چونكە هەروەكو لەو ئایەتەی كە إبن تیمیە إستدلالی پێوە كرد و ئەو اقوالانەی كە پێشتریش هێناومانەتەوە و ئەو چەند نمونەیەی كە إبن تیمیە لە قەولەكەیدا

دەیانهێنێتەوە کە لەوانە تکذیبی صفاتی الله ـش باس دەکات، بە هەموو ئەمانەدا دەزانین ئەو قیتالە بە مەبەستی ئەووەوە دەکرێت چونکە ئەوان کەوتونەتە  ناو کوفرەوە و دەبێت لەو کوفرە دەربهێنرێن تاوەکو دین هەمووی بۆ الله دەبێت.

جا ئەم حاکمەی کە یاسا دادەنێت پێچەوانەی دین و هەموو خەڵکیشی پێوە پابەند دەکات و شەڕیش لە دژی ئەو کەسە دەکات کە دژایەتی ئەم یاسایە دەکات، چ گەمژەیەك دەڵێت ئەگەر بە إعتقاد یان بە قەول إقراری پێ بکات ئیتر موسولمانە ئیللا مورجئە و جەهمی و کەڕامیەکانی قدیم و سەردەم نەبن؟

وە چ کەسانێك إجماعی سەلەف لەسەر بابەتی حکم بەسەر یاسادانانداد تطبیق دەکەن ئیللا نەفامێکی بێ ئەقڵ نەبێت کە ڕاست و چەپی خۆی لەیەك جیا ناکاتەوە و خەڵکانێك بە کوێرانە شوێنی کەوتوون بە داخەوە.

إبن تیمیة دەڵێت: "ومعلوم أن من **<u>أسقط</u>** الأمر والنهي الذي بعث الله به رسله فهو كافر باتفاق المسلمين".

واتە: **<u>ئەوە ئاشکرایە هەرکەسێك ئەمرێك یان نەهیەك پەك بخات کە الله پێیەوە رسولەکەی ناردبێت، ئەوە کافرە بە کۆدەنگی زانایان.</u>** ((مجموع الفتاوی)) (١٠٦/٨)

بە ئیزنی الله دەڵێم: هەموو شتەکان ڕوون و ئاشکران وەکو ڕوناکی خۆر، جا إبن تیمیە لەو قەولەیدا زۆر بە وازحی پێمان دەڵێت کە هەرکەسێك هەر ئەمرێك یان نەهیەکی الله پەکبخات کافرە، جا کە حاکم یاسا دادەنێت پێچەوانەی شەرعی الله پێویستە سەرەتا ئەمر یان نەهیەکی الله پەك بخات

تاوەكو یاساكەی خۆی بسەپێنێت بەسەر خەڵكیدا خۆ ئەگەر حوكمی الله پەك نەخات چۆن دەتوانێت یاسا دارێژێت و یاسا بسەپێنێت؟؟؟

وەڵام جێ دەهێڵم بۆ داستانیەكان!

جا بەڵێ كە ئەمر یان نەهیەكی الله پەك دەخات و یاسای خۆی سەردەخات مجرد بەمە إبن تیمیە دەڵێت كافرە، جا هەروەكو چۆن وشەی (دفع)ی إسحاق بن راهویەیان بە جەحد و تكذیب تەرجومە كرد لە كاتێكدا لە هیچ قاموسێك بە مانای جەحد و تكذیب نەهاتوە و بەمانای دوورخستنەوە هاتوە، سبەینێ دڵنیام یان ئەوەتا بە هەمان شێوەی وشەی دفعەكە وشەی أسقطش بە زۆر ڕادەكێشن بەلای جەحد و تكذیبدا، یانیش ئەوەتا دەگەڕێنەوە سەر ڕای پێشویان كە إبن تیمیەیان تكفیر كردبوو بەوەی سەرەكانیان دەیانگووت جەهمی و كافرە قسەی لێ وەرناگیریت و بە إبن جهمیة ناوی دەبەنەوە، جا پێیان دەڵێم: ئەگەر گومانتان لە وشەی أسقط نیە و إبن تیمیەتان بەلاوە جەهمی نییە و قسەی لێوە وەردەگرن، ئەی چی واتان لێ دەكات كە یاسادانان بە كوفر نەزانن لە كاتێكدا قەولەكەی إبن تیمیە بەخۆی هاوار دەكات.

**إبن تیمیة** لە جێیەكی دیكەدا دەڵێت: "ومن بدل شرع الأنبياء وابتدع شرعا ، فشرعه باطل لا يجوز اتباعه ، كما قال تعالى { أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله } ، ولهذا كفر اليهود والنصارى لأنهم تمسكوا بشرع مبدل منسوخ".

واتە: ئەوەی شەرعی پێغەمبەرانی گۆڕی و شەرعێكی نوێی دانا، ئەوە شەرعەكەی باطلە و جائیز نییە شوێنكەوتنی، هەروەكو چۆن الله

دەفەرمێت: (ئاخۆ ئەوانە شەریکانێکیان بۆ الله بڕیار داوە کە یاسایان بۆ دادەڕێژن لە دینێکی نوێدا کە الله ڕێگەی پێنەداوە). **وە لەبەر ئەمەش بوو کە یەهوود و نصاری کوفریان کرد چونکە دەستیان گرت بە شەرعێکی گۆڕدراوی نەسخکراوەوە**. مجموع الفتاوی (٣٦٥/٣٥)

دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی یەهوود و نصاری هەندێك جار جەحد و ئینكاریشیان دەكرد بەڵام تمسك و دەستگرتنیان بە غەیری دینی محمدەوە یان بە دینە گۆڕدراوە نەسخ كراوەكانەوە كوفر بووە، واتە ئەگەر یەكێك دەست بگرێت بە یاسا و ڕێسا و بەرنامەی غەیری دینی ئیسلامەوە، تەنها ئەو دەستگرتنەی بە غەیری دینەوە كافیە بۆ كافر بوونەوەی بەبێ مەرجی جەحد و ئینكاری، خۆ ئەگەر ئەوەشی هاتە سەر كوفر بەسەر كوفردا كەڵەكە بووە، جا لێرەدا حوكم نەكردن و زوڵم كردنی (نا هەمیشەیی كە وەكو پێشتر گوتمان لەو نێوەندەدا شتێكی وا نامێنێتەوە یان ئەوەتا حاكم قورئان دەكاتە بەرنامەی خۆی یان ئەوەتا غەیری قورئان) جیایە لە دەست گرتن و تمسكەوە، چونكە تمسك بە هەمیشەیی شوێنكەوتەی ئەو پڕۆگرام و دینەیت كە دیاریت كردووە ئیتر یاساكانی هەر شتێك بن مادەم پێچەوانەی یاسا و حوكمەكانی الله ـن بەوەی ڕێوشوێنی تێدا دیاری كراوە و ئەمر و نەهی تێدایە ئەوەش دینێكە بۆ خۆی.

إبن تیمیة دەڵێت: "نسخ هذه التوراة المبدلة، لا يجوز العمل بما فيها، ومن عمل اليوم بشراعئها المبدلة والمنسوخة فهو كافر".

واتە: ئەم تەوراتە گۆڕدراوە نەسخ كراوەتەوە، جائیز نییە كاری پێ بكرێت، هەركەس ئەمڕۆ كار بە یاسا گۆڕدراو و نەسخكراوەكانی بكات ئەوە كافرە.

مجموع الفتاوی (٢٠٠/٣٥)

دەڵێم: سەیری بکەن إبن تیمیة تەنها کارکردن بە شەریعەتی غەیری ئیسلامی بە کوفر و کافر بوونەوە ناوبرد، جا کارکردن و شوێنکەوتن و دەستگرتن بە غەیری شەریعەتی ئیسلامەوە بە عەمەل دەکرێت و کارێکی عەمەلیە نەك إعتقادی یان قەولی، کەواتە هەر کەس بەم عەمەلە اتباعی غەیری دینی محمدی کرد و شوێنی کەوت ئەوە کافرە، جا ئەگەر بە إعتقاد و قەول دانیش نەنێت بە دینەکەی محمدا ئەمەیان ربطی بە عەمەلەکەوە نییە و بەمەش کوفر بەسەر کوفردا کەڵەکە دەبێت،

# سەلماندنی كافربوونی یاسادانەر بە هێنانەوە بەڵگەی زەكات نەدەرەكان

سەرەتا پێش ئەوەی بچینە ناو باسەكەوە حەز دەكەم ئەوە بەتۆی خوێنەر بڵێم كە ئامانجی ئێمە لە كردنەوەی ئەم باسە ئەوەیە كە وەكو پشتڕاستكردنەوەیەك بۆ ئەوەی لە سەرەوە باسمان كرد بۆ تۆی خوێنەری بسەلمێنین كە حاڵی زەكات نەدەرەكانی زەمانی ئیمامی ئەبوبەكر رضي الله عنه وەكو حاڵی یاسادانەرەكان وایە كە یاسا پێچەوانەی شەرع دادەنێن، بەو جۆرەی كە زەكات نەدەرەكانی زەمانی ئیمامی ئەبوبەكر رضي الله عنه چەند تاقمێك بوون كە لەوانە ئەو تاقمە هەبوو كە جەحدی واجببونی زەكاتیان نەدەكرد و بە إعتقاد و قەول إقراریان بە واجببونی زەكاتدا دەكرد بەڵام ئامادە نەبوون بە عەمەل بیدەن و تەركی جنسی عەمەلیان دەكرد، وە لەبەر ئەم هۆكارەش ئیمامی ئەبو بەكر و هاوەڵان رەحمەتی الله بڕژێت بەسەریاندا تكفیریان كردن و بە هەڵگەڕاوە ناویان بردن و بڕیاری كوشتاری هەموو تاقمەكانی زەكاتنەدەرەكانی دەركرد، تەنانەت ئەو تاقمەشی كە جەحدی واجبی زەكاتیان نەدەكرد، كە هەر لەسەر ئەمەش لەگەڵ ئیمامی عومەر رضي الله عنه خیلاف دروست بوو لە نێوانیان، بەوەی كە ئیمامی عومەر الله لێی ڕازی بێت دەیگوت بە ئیمامی ئەبو بەكر كە چۆن كوشتاریان دەكەیت لە كاتێكدا ئەوانە شەهادەت دەهێنن، پاشان ئیمامی ئەبوبەكر قسەی خۆی دەكات كە لە خوارەوە بە تفاصیل باسی دەكەین و پاشان ئیمامی عومەر دەچێتە سەر ڕای ئیمامی ئەبوبەكر بۆ كوشتار و تكفیری ئەم زەكات نەدەرانە.

كەواتە ئەوەی شایەنی باسە لێرەدا ئەوەیە كە، زەكاتنەدەرەكان جەحدی زەكاتیان نەكرد و باوەڕیان بە واجبی هەبوو بەڵام خۆیان مەنع كرد لە تطبیقی ئەم عەمەلە لە كاتێكدا خودی زەكات نەدان كوفر نیە، وە ئەمەش دەبێتە بەڵگەیەكی پتەو و بەهێز بۆ ئەوەی بیسەلمێنین كە پابەند نەبوون بە حوكم و ئەمر و نەهی و فەرزەكانی الله ـوە كوفرە، بە هەمان شێوە پابەند نەبوون یاسادانانیش دەگرێتەوە كە یاسا دژی شەرعە پاكەكەی دادەنرێت و شەرعەكەی پەك دەخرێت و ئیشی پێوە ناكرێت و پابەندی نین، با جەحدی حوكمی الله ـش نەكەن، با بە إعتقاد باوەڕیشیان بە حوكمی الله هەبێت، با بە قەولیش إقرار بە حوكمی الله بكەن، مادەم وەكو زەكات نەدەرەكان بە یاسا قانونێك پێچەوانەی شەرعی الله دادەنێن و خۆیان و خەڵكی مەنع دەكەن لەوەی پابەندی حوكمی الله ببن و بە عەمەل تطبیقی حوكم و ئەمری الله بكەن، كەواتە ئەمە كوفرە بە الله تعالی بە كوفرێكی گەورەی دەركەر لە میللەت.

جا خوشكان و برایانی موحد با بێینە سەر باسەكەمان، ئەوە بزانن ڕەحمەتی اللەـتان لێبێت كە ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان هەڵنەستێت بە دانی زەكات، تەنها بەم زەكات نەدانەی كافر نابێتەوە ئەگەر خۆیی بە تاوانبار زانی، وە لە ئیمانەكەی كەم دەكات و كز دەبێت نەوەك پێی كافر ببێت، هەروەكو ئەوەی تەركی نوێژ چ كەم بێت چ زۆر چ یەك جار بێت چ هەمیشەیی كوفرە بە إجماع، بەڵام زەكات نەدان وەكو نوێژ نییە و خودی زەكات نەدان كوفر نیە، بەڵگەشمان بۆ ئەمە:-

أبو هريرەوە دەگێڕێتەوە كە رسول الله صلى الله عليه وسلم لە وەسفی ئەو كەسەی كە زەكاتی ماڵەكەی نادات دەفەرمێت: "ما من صاحب ذهب ولا فضة لا يؤدي منها حقها إلا إذا كان يوم القيامة، صفحت له صفائح من نار، فأحمي عليها في نار جهنم، فيكوى بها جنبه وجبينه وظهره، كلما بردت أعيدت له، في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة، حتى يقضى بين العباد، فيرى سبيله؛ إما إلى الجنة وإما إلى النار".

واتە:- هیچ كەسێك نیە كە خاوەنی ئاڵتون و زیو بێت كە لە ماڵەكەی نەبەخشێت كە لە ڕۆژی قیامەت، چەند قاپێكی بۆ ئامادە دەكرێن، پاشان لە ئاگری جەهەنەم بۆی گەرم گەرم دەكرێن، پاشان لاكانی و دەموچاوی و پشتی دەسوتێندرێت پێی، لە ڕۆژێكدا كە ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە، **پاش ئەمە ڕێگای خۆی دیاری دەكات یان بۆ جەهەنەم یان بۆ بەهەشت**. رواه مسلم (987).

دەڵێم: كەواتە ئەگەر هۆكاری كافر بوونەوە لەلای رسول الله صلى الله عليه وسلم زەكاتنەدان بوایە، ئەوە نەیدەفەرموو **پاش وەرگرتنی سزای زەكات نەدانی یان بۆ جەهەنەم دەڕوات یان بۆ بەهەشت**، چونكە كافر هەلی بەهەشتی لە ژێر دەستتا نامێنێت. كەواتە رسول الله زەكات نەدەری كافر نەكرد.

باشە پرسیارێك!

هۆكاری تكفیر كردن و كوشتاری هاوەڵان دژی زەكاتنەدەرەكان چی بوو سەرەڕای ئەوەی كە طائیفەی سێیەمیان جەحدی زەكاتیشیان نەدەكرد؟

لە وەڵامدا: وەكو پێشتریش باسمان كرد و سەلماندمان، كە هەركەسێك تاوانێك ئەنجام بدات یان سەرپێچیەكی الله تعالى بكات یان ئەمرێكی الله تعالى تطبیق نەكات، ئەمە لە تاوانبارانە و كەس ئەمانە تەكفیر ناكات ئیلا

خەواریج نەبێ، بەڵام هەروەکو پێشتریش باسمان کرد کە بۆ هێنانی ئیمانمان پێویستە مرۆڤ بە إعتقادی قەلبی بزانێت و بە زمان إقراری پێ بکات و بە عەمەلی جەوارح تصدیقی معریفەی قەلبی و إقراری قەولیەکەی بکات، کە ئەگەر تەرکی عەمەلی جەوارحی لە ئەمرێك یان فەرزێك یان حەرامکراوێك کرد بەوەی سەرپێچی الله بکات بە هەمیشەیی بێ گوێدانە گوفتەی الله و وەکو پابەند نەبوونێك بۆ ئەمر یان نەهی یان حەرامکراوەکانی الله ئەوە ئەم کەسە کافرە، ئینجا زەکاتنەدەرەکانی زەمانی ئیمامی ئەبوبەکر و عومەریش رضي الله عنهم کە دروست بوون، بەو شێوازە بوو کە بوونە چەند کۆمەڵەیەکەوە، کە کۆمەڵەیەکیان گەڕانەوە سەر بتپەرستی جاران و کۆمەڵەیەکیان باوەریان بە موسەیلەمەی درۆزن هێنا و کۆمەڵەیەکیان نوێژ و ڕۆژو و هەموو فەرزەکانی دیکەی ئیسلامیان بەجێ دەگەیاند، بەڵام ئامادە نەبوون پابەند ببن بەوەی کە زەکاتی ماڵەکانیان دەربکەن، وە تکفیر و قتالیش کران لەسەر ئەمە، نەك لەبەر ئەوەی کە جەحدی زەکاتیان دەکرد، لەبەر ئەوەی کە ئامادە نەبوون بە عەمەل پابەند ببن بە زەکاتدانەوە کە ئەمەش دەسەلمێنین بە بەڵگە إن شاءالله تعالی.

**أبو هريرة** رحمه الله دەڵێت: "لما توفي رسول الله - صلى الله عليه وسلم - واستخلف أبو بكر بعده ، وكفر من كفر من العرب ، قال عمر بن الخطاب لأبي بكر : كيف تقاتل الناس ، وقد قال رسول الله - صلى الله عليه وسلم - : " أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا : لا إله إلا الله . فمن قال : لا إله إلا الله فقد عصم مني ماله ونفسه إلا بحقه . وحسابه على الله " . فقال أبو بكر : والله ! لأقاتلن من فرق بين الصلاة والزكاة ، فإن الزكاة حق المال . والله ! لو منعوني عقالا كانوا يؤدونه إلى رسول الله - صلى الله عليه وسلم - لقاتلتهم على منعه".

واتە: كاتێك رسول الله صلى الله علیه وسلم وەفاتی كرد، أبوبكر بوە جێنشینی پاش ئەو، وە ئەوەی كافر بووەوە كافر بووەوە لە عەرەب(مەبەستی لە زەكات نەدەرەكانە)، عومەر بە ئەبوبەكری گوت: چۆن كوشتاری خەڵكانێك دەكەیت كە رسول الله صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: "ئەمرم پێ كراوە كوشتاری خەڵكانێك بكەم تاوەكو دەڵێن: هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە بێجگە لە الله، وە هەركەسیش ئەمەی گووت ئەوە خوێن و ماڵی پارێزراوە ئیللا بە حەق نەبێت، وە حسابەكەشی لای اللـەیە". پاشان ئەبوبەكر فەرمووی: سوێند بە الله كوشتاری هەموو ئەوانە دەكەم كە جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەكاتەوە، بەڕاستی زەكات حەقی ماڵە، سوێند بە الله! ئەگەر ئەوانەی كە زەكاتیان بە رسول الله صلى الله علیه وسلم دەدا مەنعی بكەن لە دانی بە من، **<u>ئەوە كوشتاریان دەكەم لەبەر ئەو مەنعە.</u>** (صحیح المسلم)

دەڵێم: پاش ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئیمامی عومەر و ئەبوبەكر رضي الله عنهم، لەسەر ئەوەی ئیمامی عومەر پێی سەیر بوو چۆن ئیمامی ئەبوبەكر كوشتاری كۆمەڵانێك دەكات كە شەهادەت دەهێنن و نوێژ و ڕۆژو دەگرن، پاشان ئەبوبەكر تێی گەیاند كە چۆن كوشتاریان ناكات لە كاتێكدا ئەوان حەقی شەهادەكەیان نەداوە بەوەی كە خۆیان مەنع كرد لە ئەنجامدانی ئەوەی كە ئەمریان پێكرابوو بە عەمەلی جەوارح، لە كاتێكدا زەكات نەدان خودی خۆی كوفر نییە كە لە سەرەوە بە حەدیثێك ئاماژەمان پێدا وە كە لە خوارەوەش دەیسەلمێنین كە هاوەڵان كاتێ كوشتاری ئەو مانعی زەكاتانەیان دەكردن لێیان نەدەپرسین ئایا ئێوە بە إعتقاد و قەول دان دەنێن بە واجببونی زەكات؟ بەڵكو تكفیر و كوشتاری هاوەڵان دژیان لەبەر تەركی جنسی عەمەل و پابەند نەبوون بە ئەمری الله ـوە بوو (كە پابەند بوونیش بە الله، بە تطبیقكردنی ئەمرەكانی الله ـیە بە عەمەلی جەوارح)، ئەمە لە كاتێكیشدا كە خودی زەكات نەدان كوفر نیە.

الترمذي لە عبدالله بن شقيق العقيليوە دەگێڕێتەوە: "كان أصحاب محمد صلى الله عليه وسلم لا يرون شيئا من الأعمال تركه كفر غير الصلاة".

واتە: هاوەڵانی رسول الله صلى الله عليه وسلم، لە عەمەلەكان هیچ شتێكی دیكەیان بە كوفر نەبینیوە بێجگە لە تەركی نوێژ. الترمذي بە ژمارە (٢٦٢٢)

دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی كە زەكات نەدان ناچێتە ژێر بابی كوفرەوە، بەڵام تاكە هۆكار بۆ ئەوەی زەكاتنەدەرەكان تكفير كران (كە لە خوارەوە بە بەڵگە دەیسەلمێنین كە تكفير كراون) مەنع كردنی خۆیان بوو لە دانی زەكات وە تەركی جنسی عەمەل بوو كە ئەگەر إقراری قەولی و معریفەی قەلبیشیان هەبوایە هەر كافر دەبوون چونكە بە عەمەل تصدیقی ئیمانەكەیان نەدەكرد.

زەكات نەدەرەكان سێ تاقم بوون:-

1. تاقمێكیان گەڕانەوە سەر جاهیلیەت و دەستیان كردەوە بە بتپەرستی.
2. تاقمێكیان باوەڕیان بە موسەیلەمەی درۆزن هێنا.
3. تاقمێكیان گوتیان: لەسەر دینەكەمان دەمێنینەوە بەڵام زەكات نادەین.

جا تاقمی سێیەمیش دوو بەش بوون:-

- بەشێكیان لەگەڵ ئەوەی لەسەر هەموو دین مانەوە بەڵام جەحدی زەكاتیان كرد و گوتیان تەنها زەكات دان بە رسول الله عليه الصلاة والسلام فەرزە، پاش وەفاتی ئەو فەرز نییە.
- بەشێكی دیكەیان جەحدی زەكاتیان نەدەكرد و باوەڕیان با واجبونی زەكات دەكرد و إقراریشیان پێدەكرد، وە لەسەر هەموو دینەكەیان مابوونەوە، بەڵام ئامادە نەبوون زەكات بدەن، وە مەنعی خۆیان

دەكرد لە دانی زەكات بە عەمەل سەرەڕای ئەوەی بە إعتقاد باوەڕیان بە واجبی زەكات هەبوو كە لە خوارەوە بە بەڵگە دەیسەلمێنین.

جا ئەوەی گرینگە لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین كە خلافی نێوان ئیمامی ئەبوبەكر و عومەر رضي الله عنهم لەسەر بەشی دووەمی جۆری سێیەمی زەكاتنەدەرەكان بوو كە باسمان كرد، كە زەكاتیان نەدەدا وەكو خۆ مەنع كردنێك لە دانی زەكات نەوەك وەكو جەحدی زەكات، كە پاش ئەوەی ئیمامی ئەبوبەكر بۆ ئیمامی عومەری ڕوونكردەوە كە بۆچی كوشتاریان دەكات، ئیمامی عومەریش چووە سەر ڕای ئیمامی ئەبوبەكر ڕەزاو ڕەحمەتی الله بڕژێت بەسەر هەردووكیاندا.

بەڵگەشمان بۆ تكفیری هاوەڵان بۆ ئەو جەماعەتەی كە اقراریان بە واجبوونی زەكات دەكرد و جەحدیان نەدەكرد، بەڵام ئامادە نەبوون بیدەن:-

أبو عبيد القاسم بن سلام(ت ٢٢٤هـ) دەڵێت: "جهاد أبي بكر -رضي الله عنه- بالمهاجرين والأنصار على منع بعض العرب للزكاة، كجهاد رسول الله -صلى الله عليه وسلم- أهل الشرك سواء، لا فرق بينهما في سفك الدماء وسبي الذرية واغتنام الأموال، فإنما كانوا لها غير جاحدين بها".

واتە: جیهادی ئەبوبەكر رضي الله عنه بە كۆچەری و پشتیوانان لە دژی ئەو عەرەبانەی كە مەنعی زەكاتیان دەكرد، لەگەڵ جیهادی رسول الله صلى الله عليه وسلم دژی ئەهلی شیرك یەكسان بوون، **كە هیچ جیاوازیەك نەبوو لە نێوانیاندا**(نێوان ئەهلی شیرك و زەكاتنەدەرەكان) لە كوشتار و بە كەنیزەك گرتنی كەسوكارەكانیان و بە غەنیمەت گرتنی ماڵەكانیان، **كە ئەوان**(زەكاتنەدەرەكان) **جەحدی ئەوەشیان نەدەكرد**(زەكات).

كتاب الإيمان ١٢

بە ئیزنی اللە تعالی دەڵێم: سەیرێكی ئەم قەولەی أبو عبید القاسم بكەن كە دەڵێت هیچ جیاوازی نیە لە نێوان ئەهلی شیرك و زەكات نەدەرەكان لەكاتێكدا زەكات نەدەرەكان جەحدی زەكاتیشیان نەدەكرد و دانیان بە واجبوونی زەكاتدا دەنا وە لەگەڵ ئەمەش كافر بوون، بۆ؟ چونكە خۆیان مەنع دەكرد لە تەسلیم بوون بە ئەمری اللە ـوە، واتە ئامادە نەبوون بە هیچ جۆرێك زەكات بدەن، كە بەمە كافر بوونەوە لە كاتێكدا خودی زەكات نەدان كوفر نیە بە بەڵگەی حەدیثی صەحیح.

إبن تیمیة لەسەر ئەم بابەتە دەڵێت: "وقد اتفق الصحابة والأئمة بعدهم على قتال مانعي الزكاة، وإن كانوا يصلون الخمس ويصومون شهر رمضان، وهؤلاء لم يكن لهم شبهة سائغة، فلهذا كانوا مرتدين، وهم يقاتلون على منعها وإن أقروا بالوجوب كما أمر الله".

واتە: هاوەڵان كۆدەنگیان هەبوو وە زاناكانی پاش ئەوانیش لە كوشتاری زەكاتنەدەرەكان، كە ئەگەر تەنانەت پێج فەرزەش نوێژ بكەن وە مانگی ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بن، ئەوانەی شوبهەكەیان سائغ نەبوو، وە لەبەر ئەمەشە مورتەد بوون، وە ئەوان قیتال دەكرێن لەبەر ئەوەی مەنعی خۆیان دەكرد لە پێدانی زەكات كە **ئەگەر دانیش بنێن بە واجبی زەكات هەروەكو چۆن اللە ئەمری پێ كردوە**.

مجموع الفتاوى (٢٨/٥١٩)

وە هەر إبن تیمیة دەڵێت: "والصحابة لم يقولوا: أأنت مقر لوجوبها أو جاحد لها؟ هذا لم يعهد عن الخلفاء والصحابة، بل قد قال الصديق لعمر رضي الله عنهما: والله لو منعوني عقالا أو عناقا كانوا يؤدونها إلى رسول الله -صلى الله عليه وسلم- لقاتلتهم على منعها، فجعل المبيح للقتال مجرد المنع لا جحد الوجوب، وقد روى أن طوائف منهم كانوا يقرون بالوجوب لكن بخلوا

بها، ومع هذا فسيرة الخلفاء فيهم جميعا سيرة واحدة، وهي قتل مقاتلتهم وسبي ذراريهم وغنيمة أموالهم والشهادة على قتلاهم بالنار، وسموهم جميعا أهل الردة".

واتە: هاوەڵان نەیاندەگوت: **ئایا تۆ دان دەنێیت بە واجبی زەكاتدا یان جەحدی دەكەیت؟** ئەمە ڕووی نەداوە لای هاوەڵان، بگرە ئەبوبەكری صدیق بە عومەری فەرموو الله لێیان ڕازی بێت: واللە ئەگەر كەسانێك مەنعی بكەن كە پێشتر بە رسول الله ـیان دەدا صلى الله على وسلم ئەوە قیتالیان دەكەم لەسەر مەنعی ئەمە، **كە ڕێگەدانی بە كوشتار تەنها بە مەنعی بوو نەوەك جەحدی واجبونی، وە وا ڕیوایەت كراوە كە چەند طائیفەیەك لێیان دانیان بە واجبونیدا دەنا بەڵام تەمبەڵیان كرد تێیدا**، وە لەگەل ئەمەشدا داستانی جێنشینەكان رسول الله لەگەڵیان هەموو یەك داستان بوو، كە كوشتنی شەڕكەرەكانیان بوو وە بە كەنیزەك گرتنی كەسوكارەكانیان بوو وە بە غەنیمەتگرتنی ماڵەكانیان بوو وە شاهیدی بەسەر كوژراوەكانیانەوە بوو بەوەی كە لە ئاگرن، وە ناونانی هەمویان بوو بە **#ئەهلی_ڕیددە**. الدرر السنية (١٣١/٨)

بە ئیزنی الله تعالى دەڵێم: إبن تیمیە بۆمان دەسەلمێنێت كە دان نان بە زمان هیچ سودێكی نییە بۆ ئیمان كاتێك كە بە عەمەل ئامادە نەبوویت تطبیقی ئەو عەمەلە بكەیت، وە بۆشمان دەسەلمێنێت كە كوشتاری ئەو مورتەدانە تەنها لەسەر مەنع كردنی بوو نەوەك جەحد كردنی، كەواتە گرنگ نیە كام تاقمەیان جەحدی زەكات دەكەن و كامیان نایكەن، گرنگ ئەوەیە هەموویان مەنعی پابەند بوونیان بە الله ـوە دەكرد بەوەی كە زەكاتیان نەدەدا بە هیچ شێوەیەك.

كەواتە لەمەوە بۆمان دەسەلمێت كە عەمەلێك هەرچەندە بە سەرپێچی كردنی الله تێیدا توشی كوفر نەبیت، بەڵام ئامادە نەبوویت تصدیقی ئیمانەكەت بكەیت بەوەی پابەند ببیت بە الله ـوە لەو عەمەلەدا، ئەوە ئیمانەكەت باطڵە

و پوچە، جا هەموو ئامانجی ئێمە لێرەدا ئەوەیە كە بڵێین حاكمی یاسادانەر تەركی جنسی عەمەلی كردووە و ئەمر و نەهی و حەرامكراوەكانی حەڵاڵكراوەكانی الله ـی پەكخستووە و مەنعی ئینقیادی الله دەكات و یاسای خۆی سەردەخات بە زەبری هێز، دەمانەوێت بڵێین كە ئەم حاكمە كافرە ئەگەر بیست هەزار ساڵ بە إعتقاد خۆیی بە تاوانبار زانی و جەحدی نەكرد و بە زمانیش تاوانبار بوونی خۆی بەیان كرد، وە ئیجماعی زانایان لەسەر كوفری بچوك هیچی لەسەر ئەمە نیە و بوختانە بۆ زانایان دەكرێت.

أبوبكر الجصاص(ت ٣٧٠) لە كتێبی (أحكام القرآن) لە تەفسیری ئایەتی 65ـی سورەتی النساء دەڵێت:

"(فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم) دەڵێ: وفي هذه الآية دلالة على أن من رد شيئا من أوامر الله تعالى أو أوامر رسوله صلى الله عليه وسلم فهو خارج من الإسلام، سواء رده من جهة الشك أو ترك القبول والامتناع من التسليم، وذلك يوجب صحة ماذهب إليه الصحابة في حكمهم بارتداد من امتنع عن أداء الزكاة وقتلهم وسبي ذراريهم، لأن الله تعالى حكم بأن من لم يسلم للنبي صلى الله عليه وسلم وحكمه فليس من أهل الإيمان."

واتە: ئەم ئایەتە دەلالەتە لەسەر ئەوەی كە شتێك ڕەد بكاتەوە لە ئەمرەكانی الله تعالی یان رسول الله صلى الله عليه وسلم ئەوە لە دەرەوەی ئیسلامە، جا ئەم ڕەدكردنەوەیەش چ لە ڕووی **#گومانەوە بێت**(لە ڕاستی ئەمرەكانی الله) **یان لە ڕووی وازهێنان لە قبوڵكردن و دوورخستنەوەی خۆیان لە تەسلیم بوون**(بە ئەمرەكانی الله ـوە)، وە ئەمەش ڕاستی ئەوەی كە هاوەڵانی بۆ ڕۆشتوون دەسەلمێنێت، **بە حوكمدانیان بە مورتەدبوونی ئەوانەی كە خۆیان مەنع كرد لە دانی زەكات**، وە بەكوشتنیان و بە كەنیزەك گرتنی كەسوكارەكانیان، **چونكە الله حوكمی داوە بەوەی كە هەر كەس**

**تەسلیمی پێغەمبەر و حوكمەكانی نەبێت لە ئەهلی ئیمان نیە.** أحكام القرآن (٢٦٨/٢)

بە ئیزنی الله دەڵێم:

أبوبكری جصاص لەسەر ئایەتی 65ـی سورەتی نساء چەند شتێكی باس كرد، لەوانە هەر كەسێك شتێك لە ئەمرەكانی الله ڕەد بكاتەوە ئەوە كافرە، جا ئەگەر سەیرێكی تفسیری أبوبكر الجصاص بكەن لەسەر وشەی رد تێدەگەن مەبەستی لە رد دوو شتە:

یەكەم:- ئەو كەسەی كە **گومانی لە ئەمرێكی الله هەیە**

دووەم:- **ئەو كەسەی كە ئامادە نیە قبوڵی ئەمرێك لە ئەمرەكانی الله بكات و تەسلیمی ببێت**، نمونەشی بۆ ئەمە زەكاتنەدەرەكانی زەمانی ئیمامی أبوبكری هێنایەوە كە مورتەد بوونەوە بەوەی كە تەركی زەكاتیان كرد، تەنها بە هۆی تەسلیم نەبونیان بۆ الله نەوەك بە هۆی جەحدیانەوە چونكە باسەكەی أبوبكری جصاص **لەسەر امتناع و تەركی قبولە بۆ گوێڕایەڵی كردنی ئەمرەكانی الله تعالی**، كەواتە لەم قەولەوە بۆمان بەیان دەبێت كە هەركەسێك وەكو زەكات نەدەرەكان مەنعی ئەنجامدانی عەمەلێكیان كرد بەوەی لە پابەند بوون بەو عەمەلەوە دەرچوون، بە مانایەكی دیكە تەركی جنسی عەمەلیان كرد، ئەوە كافرن بە الله تعالی ئەگەر جەحدی ئەو ئەمرەش نەكەن.

وە ئەمەش ڕەدێكە بۆ هەموو ئەوانەی كە وشەی رد بە جەحد تەفسیر دەكەن بە تەنها، نەخێر رد بە تەنها بە مانای جەحد نایەت، بە بەڵگەی دەلیلەكەی أبوبكری جصاص بە مانای تەركی جنسی عەمەل كردنیش دێت، كەواتە دەڵێین مەرج نییە وشەی رد بە مانای جەحد بێت بە تەنها، چونكە جەحد واتا ئینكاری كردن لەگەڵ ئەوەی كە عیلمی پێیە وە جەحد بە قەلب

و بە قەول دەكرێت، بەڵام إمتناع عن القبول و تەركی جنسی عەمەل بە عەمەل دەكرێت نەوەك بە إعتقاد یان بە قەول، وە بۆ ئەوەشی بیشیسەلمێنین كە إمتناع عن القبول و تەركی جنسی عەمەل هیچ پەیوەندیەكی نییە بە جەحدەوە سەیرێكی قەولەكەی أبوبكر الجصاص دەكەین كە نمونە بە زەكات نەدەرەكان دەهێنێتەوە كە إمتناعیان دەكرد لە دانی زەكات، كە لە سەرتریشەوە بە قەولەكەی أبو عبید الله القاسم سەلماندمان كە زەكات نەدەرەكان كە تكفیر كران و سامانەكەیان بە غەنیمەت گیرا و ژن و منداڵەكانیان بە كەنیزەك گیران **جەحدی زەكاتیان نەدەكرد** بەڵام خۆیان مەنع كردبوو لە دانی زەكات، واتە تەركی دانی زەكاتیان كردبوو بە تەواوەتی واتە تەركی جنسی عەمەلیان كردبوو، كەواتە لەمەوە بەیان دەبێت بۆمان كە هەر حاكمێك یاسا دادەنێت پێچەوانەی شەرعی الله تعالی و شەرعەكەی الله تعالی پەك دەخات، نەك یاسایەك دەیان یاسا دادەنێت و دەیان عەمەل كە بەشێكی لێكنەبڕاوی ئیمانن پەك دەخرێن و لە ئیش دەخرێن، ئەمە بە دەلیلی ئەو هەموو بەڵگانەی كە باسمان كرد و بە بەڵگەی كافر بوونی زەكاتنەدەرەكان سەرەڕای ئەوەی جەحدیان نەدەكرد، كافرە موشریكە طاغوتە، وە ئەوەشی بیكاتە وەلی ئەمر ئەویش وەكو "وەلی ئەمرەكەی" كافرە و دەجالێكە بۆ خۆی.

تێبینی: لەسەر زەكاتنەدەرەكان ئەگەر سەیری قەولی چەند زانایەك بكەین وا دەردەكەوێت كە بەلایانەوە خودی زەكات نەدان كە مرۆڤ لەبەر تەمەڵی و تەماعی دونیا نەیدات كوفرە، لە كاتێكدا ئەوان مەبەستیان لە مەنعی زەكات بوو هاوشێوەی زەكاتنەدەرەكان، چونكە حاڵەتی زەكاتیش وەكو حاڵەتی یاسادانان وایە، یاسادانان یان ئەوەتا هەموو یاساكان لە قورئان و سونەتەوە وەرگیراوە، یان ئەوەتا لە غەیری قورئان و سونەتەوە وەرگیراوە، جا لەو نێوەندەدا حاڵەتی دیكەمان زۆر بە كەمی هەیە، تەنها یەك حاڵەتی دیكەمان هەیە كە ئەویش حوكم نەكردنی جار جارە بە قورئان و سونەت لە كاتێكدا حوكمەكانی ئیسلام لە دەستووردا لانەبراون، ئەگینا حاڵەتی دیكەمان نییە لەو نێوەندەدا، (وەكو ئەوەی لە ناو دەستووردا یاساكان لە قورئان و سونەتەوە وەرگیرابێت و لە تطبیقدا زۆر بە كەمی جێبەجێ بكرێن)، شتی وەهامان نییە، یان ئەوەتا لە ئیسلامەوە یاسا وەردەگیرێت یان بە پێچەوانەوە، یانیش ئەوەتا لە ئیسلامەوەیە و جار جار حوكم نەكردنی تێدەكەوێت، كەواتە حاكم پێویستی بە بەرنامەیەكی كارە دیاری بكات بۆ بەڕێوەبردنی ئەو خەڵكە نەوەك هەر ڕۆژەو حوكمێك بدات، كەواتە بە هەمان شێوە، زەكات دانیش یان ئەوەتا جار جار لەبەر تەمبەڵی نایدەیت، یان ئەوەتا لەبەر تەماعی دونیا لە دڵەوە بڕیار

دەدەیت هەرگیز نەیدەیت، کە سروشتی زەکات وا لە مرۆڤ دەکات لەم نێوەندەدا یەك لا بگریت هەر وەکو چۆن سروشتی یاسادانان وابوو یەك لا بگریت، چونکە زەکاتیش شتێکی مکررە و لە سامانەکەتی جیا دەکەیتەوە، پێچەوانەی حەجکردن کە یەك جار لە ژیاندا ئەگەری ڕوودانی هەیە کە ئەگەر مرۆڤ بۆی نەڕەخسێت و نەیکات پێی تاوانبار نابێت ئەسڵەن چ پێی کافر ببتەوە، وە ئەگەر بۆشی بڕەخسێت و لەبەر تەمبەڵی نەیکات ئەمە پێی کافر نابتەوە، بەڵام ئەگەر نیەتی دڵی هێنابێتی کە ئەسڵەن بە ژیانیدا حەج نەکات ئەمەیان تەرکی جنسی عەمەلە، کەواتە حەج یەکجار لە ژیاندا دەڕەخسێت پێچەوانەی زەکات کە هەموو جارێك دێتەوە ڕێت و دوبارە دەبێتەوە جا یان ئەوەتا بڕیار دەدەیت بیدەیت، یان ئەوەتا بڕیار دەدەیت نەیدەیت کە ئەمەش مانع الزکاتە کە سەرەڕای کوفر نەبوونی زەکات نەدان و سەلماندنی ئەمەش بە حەدیث بەڵام ئەم مانع الزکاتە کافرە لەبەر ئەوەی تەرکی جنسی عەمەلی کردووە، کە هەندێك لە زانایان گوتویانە خودی زەکات نەدان کوفرە لەسەر بنەمای زەکاتنەدەرەکانی زەمانی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه گوتویانە کوفرە و استدلالیشیان بەو إتفاقەوە کردوە، کەواتە عەمەلی زەکاتیش تطبیق کردن و نەکردنەکەی زیاتر بەلای یاسادانانەدا چووە، بەوەی کە مرۆڤ یان ئەوەتا بڕیار دەدات زەکات بدات با جار جار لە ژیانیدا نەیدات لەبەر تەمبەڵی کە بەمە کافر نابێتەوە، یانیش لەبەر تەماعی دونیا بڕیار دەدات چیدی نەیدات کە ئەمەش تەرکی جنسی عەمەلە دەبێتە کوفر ئیتر هەر شتێکی دیکە بێت کە فەرزکرابێت یان ئەمرێکی الله بێت لەم دینە تەرکی تەواوەتی جنسی  عەمەل کوفرە، با خودی سەرپیچیەکەش کوفر نەبێت.

# ڕەددانەوەی هەندێك لە شوبهە

# باطلەكانی داستانیەكان

## شوبهەی یەكەم

مورجیئەكانی سەردەم بۆ ئەوەی بیسەلمێنن كە خودی یاسادانان كوفر نییە ئیللا مەگەر بدرێتە پاڵ الله ئینجا كوفرە إستدلال بە قەولێكی عبدالرحمن بن زید بن اسلمەوە رحمه الله دەكەن كە ١٨٢ـی كۆچی وەفات دەكات كە لە تفسیری ئایەتی ومن لم یحكم بما انزل الله ـدا دەڵێت: "من حكم بكتابه الذي كتب بيده وترك كتاب الله، وزعم أن كتابه هذا من عند الله فقد كفر".

واتە: ئەوەی حوكمی كرد بەو كتێبەی كە بەدەستی خۆی نوسیویەتیەوە وە تەركی كتێبی الله بكات، وە وابزانێت ئەوەی خۆی لە الله ـوە بۆی هاتووە ئەوە كوفری كردوە.

تفسير إبن أبي حاتم (٤/١١٤٢)

دەڵێم: مورجیئەكان هاتوون إستدلال بەو قەولەوە دەكەن دەڵێن هەتاوەكو حاكم ئەو كتێبەی كە نوسیویەتەوە بۆ حوكم كردن نەیداتە پاڵ الله ئەوە پێی كافر نابێتەوە، وە منیش پێیان دەڵێم: ئەمە ئەوپەڕی چەواشەكاریە دەیانەوێت چاوی خەڵك كوێر بكەن بەمە، وادەزانن خەڵك منداڵە و چاوی نییە و هیچ نابینێت، زۆر ناچمە ئەملاو ئەولا هەر بەو قەولە ڕەدیان دەدەمەوە كە خۆیان إستدلالی پێوە دەكەن.

یەكەم: ئەم قەولە هیچ إستثنایەكی تێ نەخستووە كە بڵێت ئیللا دەبێت ئەو كتێبەی نوسیویەتی بیداتە پاڵ الله ئینجا پێی كافر دەبێت، واتە بە گشتی

وای گوتوە نەوەك وەکو ئەوەی بڵێت **ئیللا** لەو حاڵەتەدا کە دانە پاڵ الله ـیە ئینجا مرۆڤی پێ کافر دەبێت.

دووەم: مورجیئەکان کە إستثناء دەخەنە ئەو قەولە ئیتر وەکو ئەوەیە إستثنایەکی تێدا بوبێت ئەوەی ڕیوایەتی کردووە خیانەتی لێکردبێت و شاردبێتیەوە و ئەمان حەقیقەتەکەیان دۆزیبێتەوە، مادەم إستثنای تێ دەخەن کەواتە بەو مانایەیە کە غەیری ئەو شێوازە کە دانە پاڵ اللەـیە حاکمی پێ کافر نابێتەوە، کەواتە ئەگەر بەو جۆرەی ئەوان بێت کە استثنائی تێدەخەن و دەڵێن ئیللا مەگەر بیداتە پاڵ الله ئینجا کافرە، دەبێت بڵێین عبدالرحمن بن زید بن أسلم کە استثنائی خستوەتە ناو قەولەکەیەوە ئەو کەسەی بەلاوە کافر نییە کە جەحدی کیتابی الله دەکات بەبێ ئەوەی بیداتە پاڵ الله و إستثناکەی ئەو مورجیئانە ئەمە دەگەیێنێت: "من حكم بكتاب الذي كتب بيده وترك كتاب الله، ولا يزعم أن كتابه من عند الله ولكن يجحد حكم الله فيها، هذا لا يكفر". واتە: ئەوەی حوکم بکات بەو کتێبەی کە بەدەستی خۆی نوسیویەتی و نەیداتە پاڵ الله بەڵام جەحدی حوکمی الله ـی تێدا بکات کافر نابێتەوە...... بۆ دەڵێین کافر نابێتەوە؟ چونکە ئەگەر بە قسەی مورجیئەکان بێت ئەوان إستثناءیان خستە ناو قەولەکە گوتیان دەبێت تەنها بدرێتە پاڵ الله ئینجا کافر بوونە، یان بە جۆرێکی دیکە: "من حكم بكتابه الذي كتب بيده وترك كتاب الله، ولا يزعم أن كتابه من عند الله ولكن يزعم أن كتابه أفضل من كتاب الله، وهذا لا يكفر". واتە: ئەوەی حوکم بەو کتێبە بکات کە بەدەستی خۆی نوسیویەتی، وە نەشیداتە پاڵ الله بەڵام وابزانێت کتێبەکەی خۆیی باشترە لە کتێبی الله ئەمە کافر نابێتەوە.

دەڵێم: ئەگەر بە قسەی مورجیئەکان بێت کە إستثناء دەخەنە ئەو قەولەوە دەڵێن تەنها بۆ دانە پاڵ الله ـیە چونکە لە قەولەکەدا تەنها باسی دانە پاڵ الله ـی کرد، کەواتە ئەگەر بە ئەقڵە سەقەتەکەی ئەوان بێت

ئەوە جەحد و بەباشتر زانینی حوكمی خۆت لە حوكمی الله ـش كوفر نییە چونكە لە قەولەكەدا تەنها باسی دانە پاڵ الله ـی كردوە، جا ئەوە ئەوانن استثنای تێدەخەن نەوەك ئێمە، چونكە ئێمە قەولەكە بە گشتی دەبینین، وەكو قاعیدەیەكی شەرعیمان هەیە دەڵێت(ذكر شيء لا ينافي ما عداه) واتە: باسكردنی شتێك مانای ئەوە نییە غەیری ئەوە نەفی بكات، لەو قەولەشدا باسكردنی دانە پاڵ الله كە كوفر بێت، مانای ئەوە نییە كە غەیری ئەوە كوفر نییە.

جا ئەگەر بڵێن: لە جێی دیكەدا باسی جەحد و بەباشتر زانین كراوە كە كوفرن. ئەوە منیش پێیان دەڵێم: لە جێیەك باسی جەحد و بەباشتر زانین كرابێت كە كوفر بن لە چەندین جێ باسی تشريع و یاسادانان كراوە كە مجرد بە تەركی جنسی عەمەل یان مەنع كردنی خود و دەوروبەر لە عەمەل كردن بە حوكمی الله ـوە مرۆڤ كافر دەبێت ئەگەر إقراری قەلبی و قەولیش بە حوكمی الله بكات، كەواتە ئەم قەولە وەكو گشتی گوتراوە و هیچ إستثنایەكی تێدا نییە، چونكە ئەگەر إستثنائی تێدا بێت دەبێت بۆ جەحد و بەباشتر زانینیش إستثنائی تێخەن.

لە كۆتاییدا بە ئیزنی الله تعالى دەڵێم كە یاسادانان تەنها و تەنها حەق و مافی الله تعالى ـیە بەرنامەی كار بۆ مرۆڤەكان دیاری بكات و ئیتر چ فەرزەكان بێت یان ئەمر و نەهی بێت یان حەلاڵ و حەرام بێت، دیاریكردنی ئەمانە تەنها حەق و مافی الله تعالى ـیە و كەس بۆی نییە خۆی بكات بە شەریك لەمەدا، الله دەفەرمێت: (ولا يشرك في حكمه أحدا) واتە: كەسیش ناكرێت بە هاوبەشی ئەو لە حوكمكردندا. دەڵێم: لای داستانیەكان ئەگەر طاغوتێك خۆی بكاتە شەریكی الله، هەموو

حوكمەكانی الله پەك بخات و هەموو یاساكانی الله لە ئیش بخات و تعطیلیان بكات و هیچ حسابێكیان بۆ نەكات، وە بە دڵی خۆی یاسا دابڕێژێت و لە گیرفانی خۆیەوە شت دابنێت و بیخاتە جێگای یاسا و حوكم و ئەمرەكانی الله تعالی، وە تا مردن حوكم و دادوەری بەم یاسایانەوە بكات كە لە گیرفانی خۆیەوە دەری هێناون و هیچ حسابێك بۆ هیچ كام لەو حوكمانەی الله نەكات(وەكو حەدەكان و حوكمە شەرعیەكان و هەر شتێكی دیكەی ناو ئیسلام)، دەڵێن: تەنها بە إعتقاد و بە قەول خۆیی بە تاوانبار زانی و جەحدی حوكمی الله نەكات پێی كافر نابێتەوە، منیش پێیان دەڵێم: بەم قسەتان كافر بوون بە الله، كافر بوون بە دینەكەی محمد، عەمەلتان لە ئیمان دەركردووە، نوێژ و ڕۆژوتان قەبوڵ نییە و بە ئەبەدی لە ئاگردا دەبن ئەگەر لەسەر ئەم كوفرە بمرن و تەوبە نەكەن، خوێن وماڵتان حەلاڵە تاوەكو تەوبە دەكەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالی.

ئایەت زۆرن لەسەر یاسادانان لەوانە الله تعالی دەفەرمێت: (أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله) واتە: ئاخۆ ئا ئەوانە هاوبەشانێكیان بۆ الله بڕیار داوە كە لە دین(ێكی نوێ)دا یاسایان بۆ دادەڕێژن كە الله ڕێگەی پێنەداوە. دەڵێم: الله دەفەرمێت ئەوانە شەریكن بۆ الله كە یاسادادەنێن بەڵام داستانیەكان دەڵێن: نا ئەگەر یاسا دابنێت شەریكی الله نین و مادەم بە إعتقاد خۆیان بە تاوانبار زانیوە، ئەمەش بە درۆ خستنەوەی الله ـیە، پەنا بە الله ـی تاك و تەنها.

یان الله تعالی دەفەرمێت: (إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا ألا إياه) واتە: حوكم و دادوەری تەنها بۆ الله ـیە و فەرمانی كردووە كە عیبادەتی غەیری ئەو نەكرێت. دەڵێم: الله تعالی وا دەفەرمێت بەڵام داستانیەكان دەڵێن نا ئەگەر حوكم و دادوەری بۆ غەیری الله بوو مادەم خۆیی پێ تاوانبارە پێی كافر نابێتەوە، ئەمەش بە درۆ خستنەوەیەكی دیكەی الله ـیە.

یان الله دەفەرمێت: (ولا تأكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه وإنه لفسق وإن الشياطين ليوحون إلى أوليائهم ليجادلوكم وإن أطعتموهم إنكم لمشركون)

واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن كە ناوی الله ــ لەسەر نەهێنراوە بێگومان ئەوە(خواردنی ئەوانە) تاوان و لە سنوور دەرچونە وە بێگومان شەیتانەكان بە نهێنی شت بە دۆستەكانیان دەڵێن بۆ ئەوەی مجادەلەتان لەگەڵ بكەن جا ئەگەر بە گوێیان بكەن(لە خواردنی مردارەوە بوو) ئەوە بێگومان ئێوە موشریكن.

بە ئیزنی الله دەڵێم: الله تعالى لەم ئایەتەدا شوێنكەوتنی شەریعەتێكی دیكە بە شیرك ناودەبات بەبێ باسكردنی هیچ مەرجێكی إعتقاد، تەنها مەرج بۆ بوون بە موشریك إطاعەی شەریعەتێكە پێچەوانەی حوكمی الله، كە لێرەدا كافرەكان مردارەوەبوویان دەخوارد وە داواشیان لە موسوڵمانان دەكرد ئەوانیش وەكو موشریكان مردارەوە بوو بخۆن، بەڵام الله تعالى پێی فەرموون ئەگەر بە گوێیان بكەن لە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو ئەوە ئێوەش موشریكن، جا وریا بن برایان خەواریجەكان ئەم جۆرە ئایەتانە بەكار دەهێنن بۆ تكفیر كردنی ئەو كەسانەی كە كبیرە ئەنجام دەدەن، وەكو پێشتر گوتمان ئەنجامدانی كبائرەكان كوفر و شیرك نییە، بەڵام كردنی ئەم كبیرانە بە پرۆگرامی ژیانت بەوەی كە هیچ حسابێك بۆ ئەمری الله نەكەیت و بە هەمیشەیی كبیرە بكەیت و تەركی جنسی عەمەل بكەیت(كە لێرەدا وازهێنانە لە پابەند بوون بە اللەوە بە گوێڕایەڵی نەكردنی لە تەركی ئەو كبیرەیەدا) وەكو ئەوەی كە الله پێمان دەفەرمێت كە ئەگەر گوێڕایەڵیان بكەن لە خواردنی مردارەوە بوو وەكو پابەند نەبونێك بە ئەمری الله ــ وە و تەرك كردنی گوێڕایەڵی الله لە دووركەوتنەوە لە مردارەوە بوو، ئەوە ئێوە موشریكن واتە بە مجرد گوێڕایەڵی كردنیان لە خواردنی مردارەوە بوو بە هەمیشەیی دەبن بە

موشريك، كەواتە ئەم ئایەتە بەهێزترین بەڵگە و ڕەددە بۆ كەڕامیەكانی سەردەم ئەوانەی كە عەمەلیان لە ئیمان دەركردووە، كە جنسی أعمالەكان مەرجێكی سەرەكی ئیمانن كە تەركی تەواوەتی یەكێك لەم جنسە أعمالانە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمان وە سەرەرای إقراری قەول و معریفەی قەلبی هەر كافر بوونە، هەروەكو حاكم كاتێك پێچەوانەی شەرعی الله یاسا دادەنێت و تەركی شەرعی الله دەكات و هیچ عەمەل بەو شەرعەوە ناكات و پابەند نییە بە الله ـوە، سەدبارەی دەكەمەوە هیچ كەسێك ئەم حاكمە بە موسوڵمان نازانێت ئیللا مورجیئەیەكی كافری وەكو مەدخەلیەكان و داستانیەكان نەبێت.

## شوبهەی دووەم

یەكێكی دیكە لە شوبهە باطلەكانی داستان محمد و داستانیەكان كە زۆر زۆر مندالانە و باطلە، بە هێنانەوەی ڕووداوێك لە ژیانی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان الله لێی ڕازی بێت دەیانەوێت بڵێن كە یاسادانان كوفر نییە.

پرسیارا!

ئایا معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان یاسای دانا یان تشریعی كرد كاتێك گوتی: موسوڵمان میرات لە كافر(ئەهلی كیتاب) دەبات؟

جا لێرەدا داستانیەكان بە هێنانەوەی ئەم ڕوداوە دەیانەوێت بڵێن یاسادانان كوفر نییە، شوبهەكەشیان بەم جۆرەیە كە دەڵێن:-

رسول الله علیه صلاة وسلام فەرموویەتی: "موسوڵمان میرات لە كافر نابات و كافریش میرات لە موسوڵمان نابات"، وە كەسێك هاتە لای معاویە الله لێی ڕازی بێت پێی گوت: "باوكم لە نەسارایە و براكانیشم بە هەمان شێوە، جا بۆیە موسەڵمان نابم دەترسم میراتم لە باوكمەوە دەس نەكەوێت".

معاویەش پێی گوت: "ئێمە میرات لەوان دەبەین هەروەکو چۆن ژنیان لێ دەخوازین، بەڵام ئەوان میرات لە ئێمە نابەن هەروەکو چۆن ژنمان لێ ناخوازن(ئەهلی کیتاب)". بۆیە بە بەکار هێنانی ئەمە شوبهەیەکی زۆر باطڵ و منداڵانە دروست دەکەن و دەڵێن: "مادام موعاویە حوکمێکی رسول الله ـی گۆڕی و دژی حوکمی رسول الله علیه صلاة وسلام یاسای دانا وە لەگەڵ ئەمەشدا کافر نەبووەوە، کەواتە خودی یاسادانان کوفر نییە ئیلا مەگەر یاسادانانەکە بە زمان و دڵ بە جائیز بزانێت یان لە یاسای الله بەباشتر بزانێت".

لە وەڵامدا دەڵێین: لە ئایینی ئیسلامدا دوو شتمان هەیە.

1. شتانێك کە محکمن و إجتهاد هەڵناگرن و بە بەڵگەی ئایەت و حەدیث و ئیجماع چەسپاون کە معلوم من الدین بالضرورةن کە بەڵگەی قەتعیان لەسەرە و کەس ناتوانێك پێچەوانەی ئەمانە فەتوا بدات یان حوکم دەربکات، وەکو حەرامێتی زینا و حەرامێتی دزی و کبائرەکانی دیکە، کە ئەمانە بەڵگەی تەواو و قەتعیان لەسەرە کە حەرامن کەس ناتوانێت چ پێچەوانەی ئەمانە فەتوا بدات، چ پێچەوانەی ئەمانە یاسا دەربکات.
2. ئەو شتانەی کە متشابهن و إجتهاد هەڵدەگرن وەکو بابەتی شکانی دەستنوێژ لە هاوسەر، یان چەند بابەتێکی فیقهی کە إختلاف و ڕاجیاییان لەسەرە، یان تەنانەت ئەگەر بابەتێك إجماع و کۆدەنگیشی لەسەر هەبوو وە حەدیث و بەڵگەی قتعیشی لەسەر هەبوو بەڵام لە نێو سەلەف هەر ڕاجیاییەك لابەلا هەبووە لەسەر، وە فتوادان پێچەوانەی ئەمە نابێتە کوفر، بە دەربڕینێکی دیکە بیڵێم ئەو بابەتانەی کە معلوم من الدین بالضرورة نین.

وە هەر لەم بارەوە رسول الله صلی الله علیه وسلم کە عمری کوڕی عاص بۆمان نقڵ دەکات فەرموویەتی: "إذا حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب، فله أجران، وإذا حكم فاجتهد ثم أخطأ، فله أجر".

واتە: ئەگەر دادوەر(یان زانا) إجتهادی کرد و پێکای ، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر إجتهادی کرد و نەیپێکا، ئەوا یەك پاداشتی بۆ هەیە.

رواه مسلم ١٧١٦.

جا بابەتی میرات لە جۆری دووەمە، ڕا جیاوازی و إجتهادی هەڵە تێیدا نابێتە حکم بغیر ما انزل الله یان یاسادانان دژی شەرع بەڵکە تەنانەت ئەجر و پاداشتیشی دەبێت، چونکە بابەتەکە سەرەڕای ئەوەی کە بەڵگەی قتعی لەسەرە (کە حەدیثە) بەڵام ڕاجیاوازی لەسەر ئەمە هەر هەبووە، کەواتە با ئەم ڕاجیاوازیە تێکەڵ بە یاسادانان نەکرێت چونکە یاسادانان لە دوو شتدا لە إختلاف جیاوازە، بەوەی کە:

- یاسادانان دژی یاسایەك یان حوکمێکی شەرعە کە معلوم من الدين بالضرورةیە، وەکو ڕێگەدان بە زینا لە وڵاتدا، بەڵام ڕاجیاوازی، لەسەر شتانێکە کە معلوم من الدين بالضرورة نیە وەکو ڕاجیاوازی لە هەندێ بابەتی فیقهی.
- یاسادانان بە عەمەل دەکرێت بەڵام ڕاجیاوازی لە إعتقاد و قەولەوە سەرهەڵدەدات.

کەواتە بابەتی میرات لە کافران(ئەهلی کیتاب) معلوم من الدين بالضرورة نییە و ئیختیلافی هەر لەسەر هەبووە، وە ئەم بابەتەش بە إعتقاد إختلافی لەسەر بووە واتە هەندێك بە إعتقاد گوتیانە حەرامە یان حەلالە لە کاتێکدا یاسادانان دژی شەرع تەنها بە عەمەل بەسە بۆ کافر بوونەوە.

جا دوو ڕای جیاواز لەسەر بابەتی میرات هەیە:

یەكەم: بەشی هەرە زۆری سەلەف دەڵێن كە بە هیچ شێوەیەك نە موسوڵمان میرات دەدات بە هیچ جۆرە كافرێك نە میرات لە هیچ جۆرە كافرێكەوە وەردەگرێت.

دووەم: بەشێكی كەم لە سەلەف لەوانە صحابیش هەیە پێش معاویە گوتویانە كە موسوڵمان بە هیچ جۆرێك میرات نادات بە هیچ جۆرە كافرێك بەڵام موسوڵمان جائیزە میرات لە باوكی ئەهلی كیتابی غیر محاربەوە بەرێت كە إبن حزم لە المحلی (٢٠٤/٩) هێناویەتی لەوانە: معاذی كوڕی جبل، محمدی كوڕی عەلی كوڕی حسێن، سعیدی كوڕی المسیب، مسروقی كوڕی الاجدع، یەحیای كوڕی یعمر و إسحاقی كوڕی ڕاهویە محمدی كوڕی الحنفیة(رضي الله عنهم ورحمهم الله)، كە تەنانەت تیایاندایە پێش معاویەش ژیاوە.

وە بە هەمان شێوە إبن تیمیةش ڕای وایە كە موسوڵمان میرات لە ئەهلی كیتابی غیر محاربەوە دەبات.

وە إبن القیمیش لە (أحكام أهل الذمة)دا باسی ئەم ڕاجیاوازیە دەكات كە لە نێوان سەلەفدا هەبووە!

كەواتە با داستانیەكان چەواشەی نەكەن و نەڵێن معاویە لە خۆیەوە شتی داهێنا و حكم بغیر ما انزل اللە ـی كرد و یاسای دانا دژی شەرعی اللە و پێشی كافر نەبووەوە و ئەمەش بكەنە بەڵگە بۆ ئەوەی یاسادانان بە كوفر ناونەبەن، كەواتە پێش معاویە چەند صحابة و زانایەك ڕایان جیاواز بووە لەم بابەتە كە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە معاویە حكم بغیر ما انزل اللە ـی نەكرد و تەنها إجتهادێكی كرد و نەیپێكا نەوەك یاسای دانابێت دژی شەرعی اللە تعالی.

جا با خۆمان بخەینە جێگای داستانیەکانەوە کە دەڵێن: "حکم بغیر ما انزل الله لە هەموو حاڵەتەکاندا(لە یاسادانان و غەیری یاسادانانیدا) کوفری بچوکە (ئیلا مەگەر بە إعتقاد یان قەول جەحدی حوکمی الله بکات یان خۆیی بە تاوانبار نەزانێت یان یاساکەی خۆی بە باشتر بزانێت لە یاسای الله) ئینجا کافرە" ، کەواتە ئەگەر معاویە حکم بغیر ما انزل الله ـی کردبێت بە قسەی داستانیەکان(کە حکم بغیری ما انزل الله نەبوە لە ڕاستیدا)، ئەوە حاڵی معاویە لە دوو حاڵەت تێپەڕ ناکات لێرەدا:

- یان ئەوەتا ئەم حکم بغیر ما انزل الله ـیە بە شەهوەتی خۆی کردووە و خۆیی بە تاوانبار زانیوە و لەبەر دونیا ئەمەی کردووە (کە وا نییە)، کەواتە کوفری بچوکی کردووە بەم کارەی کە ئەمە لە صەحابە ناوەشێتەوە(چونکە داستانیەکان دەڵێن حکم بغیر ما انزل الله کوفری بچوکە).
- یان ئەوەتا ئەم بڕیارەی وەکو إعتقادی خۆیی داوە(کە سەد لە سەد معاویە وەکو بیروباوەری خۆی گوتویەتی موسوڵمان دەتوانێت میرات لە باوکی کافری غیر محارب ببات)، کەواتە بەم قسەیە بێت معاویە کافرە، چونکە کە معاویە حکم بغیر ما انزل الله دەکات لێرەدا بڕیارەکەی خۆی بە حەق دەزانێت(لە کاتێکدا نەپێکاوە)، کەواتە بەم پێیە بێت و بە قسەی داستانیەکان بێت کە دەڵێن حکم بغیر ما انزل الله لە هەموو حاڵەتێکدا کوفر بچوکە ئیلا مەگەر جەحدی حوکمی الله بکات یان خۆیی بە تاوانبار نەزانێت، لە کاتێکدا معاویە نەك خۆیی بە تاوانبار نەزانیوە بگرە ئەم حوکمەی خۆی بە حەق زانیوە و داویەتە پاڵ الله، واتە ئەم فەتوایەی کە داوە کە لە داستانیەکان بووەتە حکم بغیر ما انزل الله وەکو ئەوە داویەتی کە ئەمە حەقەکەیە، نەوەك ئەوەی ئەمەی بە لەبەر شەهوەتێك کردبێت و لەولاشەوە بڵێت من خۆم بە تاوانبار دەزانم، جا نەك معاویە ئەگەر بە قسەی داستانیەکان هەموو إختلافێك حکم بغیر ما انزل الله بێت، ئەوە دەبێت هەموو ئومەتی ئیسلامی کافر بن چ لە

زانانایانەوە تا خەڵكی، چونكە ڕاجیاوازی و إختلاف هەموو زەمەنێك و هەموو كاتێك هەبوە، وە إختلافیش بە إعتقاد دەكرێت، واتە یەكێك كە ڕای جیاوازە لە یەكێكی دیكە ئەوەی خۆی بە حەق دەزانێت لەوی دیكە، بۆ نمونە ئێستا هەندێك زانایان كە دەڵێن دەستنوێژ لە هاوسەر ناشكێت و هەندێكی دیكە دەڵێن دەشكێت ئەمەیان وەكو بیروباوەر گوتوە.

كەواتە داستانیەكان لێرەدا دوو شتیان لە پێشە:

یان ئەوەتا دەبێت بڵێن: موعاویە كافر بووەوە بەمە، چونكە لەگەڵ ئەوەی حكم بغیر ما انزل الله ـی كرد، حوكمەكەی خۆشی بە حەق زانی، وە ئەویش وەكو ئێمە مرۆڤە و معصوم نییە و بەرائەتی بۆ نەهاتووە تاوەكو بڵێن: نەخێر بۆ معاویە بە هیچ شێوەیەك كوفر نییە.

یان ئەوەیا دەبێت بڵێن: ئەم كارەی معاویە هیچ پەیوەندی بە حكم بغیر ما انزل الله(چ لە تشریع یان غەیری ئەوە) یان تشریع و یاسادانانەوە نییە و بە دەستی خۆیان ئەم شوبهەیەیان هەڵبوەشێننەوە و بڵێن: ئێمە هەڵەمان كرد لەم إستدلالە و چەواشەمان كرد.

## ئەوەی داستانییەكان تێكەڵیان كردووە بەسەر یەكدا

ئەم داستانیانە هاتوون یاسادانان لەگەڵ حوكم نەكردنی حاكم بە قورئان (لەكاتێكدا حوكمی قورئانی تعطیل نەكردبێت و لە دەستوور دفعی نەكردبێت و لە حوكم لاینەبردبێت و یاسای دانەنابێت دژی)، لە یەك جیاناكەنەوە و تێكەڵ و پێكەڵیان كردووە بەسەر یەكدا. هاتوون چیان كردوە، بە ئەقڵی خۆیان وایان گومان بردووە كە حاكم كاتێك یاسا دادەنێت و حوكم بەو یاسایەی خۆی دەكات لەباتی یاسای الله، هاتون دەڵێن: "ئەم حاكمە حكم بغیر ما انزل الله ـی كردووە، ئێ زانایانیش

إجماعیان هەیە کە حکم بغیر ما انزل الله کفر دون کفره نەوەك کوفری أکبر، ئێ کەواتە یاسادانان کوفر نیە".

جا برایانی موحد ئەمە ڕێك وەکو ئەوە وایە کە بڵێی: "کەسێك هەتا مردن کبیره بکات و زینا و دزی و قەتڵ بکات و مەشروب بخواتەوە، هیچ أعمالێکی صالحی نەبێت بۆ الله ـی کردبێت و هیچ پابەند نەبوبێت بە ئەمری الله ـوە، ئەوە ئەم کەسە کافر نییە مادەم جەحدی ئەمری الله ـی نەکردووە وە چونکە ئەنجام دانی تاوانە گەورەکان کوفر نییە و سەرپێچی الله ـیە".

دەڵێم: ئەمانە هاتوون دوو حاڵەتی جیاوازیان تێکەڵ کردووە بەسەر یەکدا و خۆیان و دەوروبەریان خستوەتە گێژاوێکەوە تا مردن لێی دەرباز نابن ئیلا یەکێك الله رەحمی پێ بکات، بەوەی کە ئیجماعی سەلەف تطبیق دەکەن بەسەر یاسادانانەدا و دەڵێن: "هەردووکی حکم بغیر ما انزل الله ـیە" و بە هێنانەوەی ئیجماع لەسەر حاڵەتێکیان ئەوی دیکەش چەواشە دەکەن، کە دەڵێن: "هیچیان کوفر نین و پەیوەستن بە إعتقادەوە".

جا با سەیری حاڵی سەلەف بکەین و بزانین حاڵی زەمەنی خۆیان چۆن بووە کاتێك گوتویانە حکم بغیر ما انزل الله کوفر نییە، بە وردبوونەوە لەمە دەزانین کە سەلەف مەبەستیان لە کام جۆرە حوکم نەکردن بوە:-

لە زەمەنی سەلەفدا لە هەر سێ قەرنەکە هەموو حاکمەکان بە حاکمە مورتەدەکانیشەوە حوکمی الله ـیان لە دەستووردا پاراستوە، بەو مانایەی کە حوکمی الله ـیان بەسەر تاك بە تاکی کۆمەڵگادا تطبیق دەکرد بێ جیاوازی.

وە هیچ حاکمێکمان نەبووە کە یاسای دژی حوکمی الله داڕشتبێت و حوکمی الله ـی پەککخستبێت، و لە عەمەل پێکردن دووری خستبێتەوە

بەوجۆرەی کە لەم کتێبەدا باسمان کرد لە تەرکی جنسی عەمەل، هیچ حاکمێکمان لەو سێ قەرنە نەبووە بە تەحەداوە.

ئەوەی ڕویداوە لە حاکمەکانی ئەو سێ قەرنە ئەوە بووە کە جار جارە لەبەر خزمێکی خۆیان لەبەر ڕەشوە و شەهوەتێك حوکمێك لە حوکمەکان یان ڕوونتر بیڵێین حەدێك لە حەدەکانییان تطبیق نەکردووە لەگەڵ ئەوەشدا نە جەحدیان کردووە نە ئینکاریان کردووە نە لە حوکم و دەستوور پەکیان خستووە نە دووریان خستوەتەوە لە حوکم پێکردن وە نە تەرکی جنسی عەمەلیان کردووە لەمەدا.

بۆ نمونە کاتێك حاکمێك پورزاکەی دزی دەکرد لەبەر خاتری پورزاکەی دەستی نەدەبڕیەوە ئەم حاکمە لێرەدا حوکمی نەکرد بە حوکمی الله و حکم بغیر ما انزل الله ــی کرد بەڵام کافر نەبوەوە، وە ئیجماعی هەموو سەلەفیش لەسەر ئەم حوکم نەکردنانە بووە نەوەك یاسادانان.

وە بۆ نمونە، کاتێك باوکێك دەمرێت، کاتێك حاکم میراتی باوکەکە بەسەر منداڵەکانیدا دابەشدەکات، کچەکان و کوڕەکانی هاوبەش دەکات و هەر یەکەو یەك بەشیان پێدەدات، ڕاستە ئەم حاکمە لێرەدا حکم بغیر ما انزل الله ــی کرد، بەڵام خۆیی بە تاوانبار زانی و جەحدی حوکمی الله ــی نەکرد، بەمە کافر نەبوەوە و ئیجماعی سەلەف لەسەر ئەم حاڵەت و حوکم نەکردنەیە نەوەك یاسادانان.

بەڵام تۆ وەریت ئیجماعی سەلەف لەسەر بابەتی حکم بهێنیت و تطبیقی بکەیت بەسەر ئەو حاکمەدا کە بە یاسا حوکمی دەستبڕینی پەك خستووە و بە حەیاتی دەستی هیچ دزێك لە وڵاتەکەیدا نابڕێتەوە و هەرکەس دزی بکات دەیخاتە زیندانەوە بێ جیاوازی، وە ئیجماعی سەلەف بهێنیت و دایبەزێنیت بەسەر ئەو حاکمەی کە بە یاسا دەنوسێت ژن و پیاو یەکسانن

لە وەرگرتنی میراتدا وە ئەم دوو یاسایەش بەسەر تاك بە تاكی هاوڵاتیەكانی وڵاتەكەیدا تطبیق بكات و گەورە و بچوكی پێوە پابەند بكات و بە ژیانی عەمەل بە حوكمی الله نەكات و هیچ حسابێكی بۆ نەكات، وە بە هێزیش حوكمی خۆی بەسەر حوكمی الله ـدا سەربخات و ئەوەی سەرپێچی لە حوكمەكەیدا بكات بە هێز ڕوبەڕوی ببێتەوە سزای بدات، تۆ وەریت و بڵێیت: "مادەم سەلەف گوتویانە حكم بغیر ما انزل الله كوفری بچوكە كەواتە ئەم حاكمەی كە بەوجۆرە یاسادادەنێت كافر نیە مادەم جەحد و ئینكاری حوكمی الله ــی نەكردووە!".

منیش پێت دەڵێم: بە الله قەسەم بەم قسەیەت كافر بوویت، بە الله قەسەم موشریكیت، بە الله قەسەم خوێن و سەرو ماڵت حەلاڵە بەم قسەیەت، بە الله قەسەم نوێژ و ڕۆژوت هیچ قبوڵ نییە و هەموو أعمالی صالحەت إحباط دەبێت، بە الله قەسەم بە ئەبەدی لە دۆزەخیت، ئەگەر تەوبە نەكەیت، جا پێش ئەوەی بگەڕێیتەوە بەردەم الله و سزای الله بچێژیت تەوبە بكە لەو كوفرەی كە تێی كەوتویت، چونكە سزای الله هەمیشەییە و قەت نەجاتت نابێت لێی.

لە کۆتاییدا داواکارین لە الله تعالی لێمان خۆش بێت و هیدایەتمان بدات بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆیی، لە گوناهـ و تاوانەکانمان خۆش ببێت و ڕەحممان پێ بکات و بە ڕەحمی خۆی لەگەڵمان بجوڵێتەوە و بە ڕەحمی خۆی بمانخاتە بەهەشتی پان و بەرینەوە و لەگەڵ پێغەمبەران و پیاو چاکان و شەهیدان حەشرمان بکات و کۆمان بکاتەوە و لە سزا و ئاگری دۆزەخ بە دوورمان بخات آمین آمین والحمد لله رب العالمين.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه إلى يوم الدين.

عبدالله بتوێنی

٢٠٢١/١٢/١

٢٦/ربيع الثانی/١٤٤٣